# بەشێك لە بیرەوەرییەکانی

# مام جەلال



وەرگێڕانی: سۆران عەلی

# بەشێك لە بیرەوەرییەکانی
# مام جەلال

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: سۆران عەلی

■ ناوی کتێب: بەشێك لە بیرەوەرییەکانی مام جەلال

■ ئامادەکردنی: مەعد فەیاز

■ وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: سۆران عەلی

■ پێداچوونەوەی: عەبدولکەریم شێخانی

■ دیزاین و بەرگ: شۆڕش ئەحمەد

■ تیراژ: (5000)

■ سەرپەرشتیاری چاپ: نەوزاد شێخانی

■ چاپ: چاپی یەکەم / کەرکوك / 2009

■ زنجیرە ( 62 ) لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك

پێشکەشە بەوانەی  ڕێز لە خەبات و
تێکۆشانی سەرکردەکانیان دەگرن

# ناوەرۆك

## پێشەکی

ئەم کتێبەی لەبەردەستاندایە بەشێکی کەمە لە بیرەوەریەکانی (مام جەلال)، گێڕانەوەیەکی رۆژنامەنوسیانەیە لەلایەن رۆژنامەنووس (مەعد فەیاز) لە رۆژنامەی (ئەلشەرقولئەوسەت)ی لەندەنی بە زمانی عەرەبی نوسراوە و (سۆران عەلی) رۆژنامەنووسی کورد لە رۆژنامەی (ئاسۆ) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، گەرچی دیدارێکی درێژخایەنی رۆژنامەوانییە، بەڵام بەرکولێکی بەپێز و پڕ بایەخە و پڕە لە زانیاری بەکەڵك بۆ دەرخستنی قۆناغێکی گرنگی مێژوویی و بزووتنەوەی سیاسیی کورد و ژیانی سیاسیی کەسایەتیەکی تێکۆشەری ناسراوی گەلەکەمان.

خاوەنی بیرەوەرییەکان کەسێکی بەتوانا، ئازاو موتەمەیزە. لە ئێستادا وەك شەخسیەتێکی گەورەی کورد و عیراقی و نێودەوڵەتی لە تەواوی دونیادا ناسراوە، وردەکارییەکانی ژیانی و چۆنێتی دەستپێکردنی خەباتی و قۆناغەکانی تەمەن و تێکۆشانی کە ئەم دیدارە بەشێکیانی لەخۆ گرتووە، کارێکی باشە بۆ ئەوانەی ئەم پیاوە گەورەیەیان لە دوورەوە ناسیووە.

ئەوان بەخوێندنەوەی ئەم چەردەیە لە بیرەوەرییەکانی، باشتر و زیاتر ئاشنای دەبن، بایەخەکەی لەم کاتەدا زیاترە چونکە کوردستان و عیراق هەنگاو بەرەو گۆڕانی چارەنوسساز دەنێن.

وا دەزانم کەسایەتی و ئەزموونەکانی مام جەلال لە دونیای سیاسەتی ئەمڕۆدا کاریگەریی بەرچاویان دەبێ لەسەر ئەم گۆڕانکارییە چاوەڕوانکراوانە و بۆ نەوەکانی داهاتووش دەبنە رێچکە و ئامۆژگاری.

پاییزی ساڵی 1957 بۆ یەکەمجار مام جەلال-م لە کەرکوك بینی، ئەوکات ئەندامی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بووم و لە پۆلی چوارەمی دوا ناوەندی لە قوتابخانەی موسەللا دەمخوێند. ڕەحمەتی کاك عەلی عەسکەری منی بە مام جەلال ناساند، دوو ساڵ دواتر لە 1959 دا لەگەڵ ڕەحمەتی حەمە سەعید بەگی جافدا لە بەغدا بۆ سەردانی عەقید فەتاح شاڵی لە دادگای مەهداوی لە بەغدا بەرێگاوە بووین، مام جەلال لای ئەوان بوو ڕووبەڕوومان هات و چاك و چۆنی لەگەڵ کردین، حەمە سەعید جاف ویستی بە مام جەلال-م بناسێنێ یەکسەر مام پرسی کاکە حەمە چۆنی، لەبیرمە لە کەرکوك لەگەڵ کاك عەلی عەسکەری یەکترمان بینیووە، ئەوکاتە وەك کەسێکی وریا و بە ئاگا و کەسێکی شیکپۆش هاتە بەرچاوم، لەوکاتەوە تا ئەمڕۆ لە زەمان و جێگای جیاجیادا لە نزیکەوە ئەم پیاوە شۆڕشگێڕە بە توانا و زیرەکەم ناسیووە. بەدرێژایی پەنجا ساڵ زیاترە مۆرکی کەسایەتی و بیر و بۆچوون و نەزەری سیاسیی بەسەر کۆمەڵگای کوردەوارییەوە دیارە، ڕەمزێکی ناسراوە لە خەباتی ڕزگاریخوازی کوردەواریدا و لای گەلانی دوور و نزیکی غەیری کورد. کاریگەریی لەسەر هزری زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی کورد و غەیری کورد بەجێهێشتووە.

لەو ماوە دوور و درێژەی رابردوو لەوانەیە هاوڕا نەبووبێتم دەربارەی هەندێ بابەتی سیاسیی لەگەڵیدا، بەڵام پەیوەندی و دۆستایەتیمان هەرگیز کەلێنی تێنەکەوتووە. بەشی زۆری مانەوەی ئەو پەیوەندییە دۆستایەتییە بۆ کەسایەتی و ئەزمونی مام دەگێڕمەوە. ئەوەی بەدیم کردووە ئەم پیاوە تا مەودای گفتووگۆ و لێکحاڵی بوون هەبێت ئەوپەڕی سوودی لێوەردەگرێت، (قەتیعە و پچڕاندن) دوا چارەسەری نەخوازراوە لای ئەو.

ئەگەر مام خۆی ڕاستەوخۆ بیرەوەرییەکانی بنووسێت وادەزانم بەپێزتر و ڕاشکاوانەتر باسی ڕووداوەکان دەکات، کە نوکتە باسکراوەکانی لەسەر خۆی بگێڕێتەوە ئیتر چی باکی هەیە لەوەی هەموو ڕووداوەکان ڕاشکاوانە باس بکات، ئەگەر چی ئەزموونەکە ئەوەندە زۆرە باسگەلێك زیان بە برایەتی و تەبایی و یەکڕیزی کوردەواری بگەیەنێت، لێدەگەڕێت بۆ کاتێکی گونجاوتر.

مام هەمیشە سەرقاڵە بە کاری حزبیی، پێشمەرگایەتیی، سیاسییەوە. لەم دواییەشدا کاری دیپلۆماسی و حکومی و سەفەری زۆری هاتۆتە سەر، بەڵام لە شاخ و لە شار لایەنی ڕۆشنبیری و خوێندنەوە و بەدواداچونی فەرامۆش نەکردووە. لە کۆتایی نەوەدەکاندا لێی پرسیم جگە لە کاری سیاسی بەچیەوە خەریکی؟ باسی وەرگێڕانی کتێبەکەی (فازڵ حسێن، کێشەی ویلایەتی موسڵ) م بۆ کرد کە دەستم داوەتە وەرگێڕانی بۆ کوردی. دیاربوو لە کتێبەکە بە ئاگابوو، دەیزانی بایەخی وەرگێڕانی کتێبێکی زانستی لەو جۆرە بۆ دەرخستنی ڕاستییە مێژووییەکانی کێشەی و یلایەتی موسڵ

و كەركوك چەند گرنگە بەتايبەت بۆ نەوەكانى ئێستا و داهاتوومان كە كەسێكى غەيرە كورد لە سەردەمى بێكەسيى كورددا بەرێبازێكى زانستيانە واقيعى كوردستانيەتى ئەو ناوچانەى سەلماندووە، لەو كاتەدا وەرگێڕانى بۆ كوردى چەند گرنگ بوو، بۆيە وتى: كتێبێكى گرنگە كارێكى باشە تەرجەمەى بكەيت، با بيبينم خۆم پێشەكى بۆ دەنووسم. جارێكى تر لێى پرسيم كتێبەكەى موسڵ چى بەسەر هات؟ بەڕاستى پێم خۆش نەبوو سەرەڕاى سەرقاڵيى زۆرى، بە نووسينى ئەو پێشەكييەوە ماندووى بكەم، بەڵام سەرئەنجام دەقە وەرگێڕدراوەكەى لێوەرگرتم لەگەڵ ئەسڵە عەرەبييەكەى، پاش ماوەيەك پێشەكيەكى تێروتەسەل و وردى نووسى بوو، دياربوو كورديیەكە و عەرەبييەكەى بەراورد كردبوو كاتێكى باشيشى بەو بابەتەوە بەسەر بردبوو. كە ئەمەش خەمى گەورەى مام جەلال دەردەخات لەلايەك بۆ بوارى ڕۆشنبيرى و لە لايەكيش بۆ مەسەلەى ڕەواى گەلەكەمان و بەتايبەت مەسەلەى كەركوك. كە وەك خۆى لە پێشەكى كتێبەكەدا نوسيبووى (ئەم كتێبە ديراسەيەكى عيلميە، تێزێكى دكتۆرايە، خوێندەوارێكى عەرەبى موسڵاوى پێى هەستاوە و لە دانشگاكەى خۆيدا بە دەرەجەى زۆر باش بۆى پەسەند كراوە و لێى وەرگيراوە. لەوەش زياتر ڕاستييەكان ئەوەندە زەق و گەشن كە جاميعەى بەغداش لە سەردەمى حوكمى بەعسى عەفلەقيدا نەيتوانيووە ناديدەى بگرێت و بەڵكو ئەركى چاپكردنەوەى گرتۆتە ئەستۆ و لە ساڵى 1977 لەو پەڕى دەسەڵاتدارێتى بەعسدا چاپيان كردۆتەوە). بۆيە ئەگەر ژيانى مام جەلال

وەك ڕۆشنبیرێك تەماشا بكەین، پڕە لە سەروەری و دەستكەوت بۆ میللەتەكەی، ئەگەر وەك سیاسییەك و تێكۆشەرێك لێی بڕوانین بەهەمان شێوەیە.

مام جەلال لەماوەی زیاتر لەپەنجا ساڵدا وەكو ڕەمز بۆ كورد ناسراوە و میللەتانی جیهان ڕێز و حورمەتیان هەیە بۆ ڕەمزەكانیان، پێموایە هیچ نەتەوەیەك و كۆمەڵگایەك بێ ڕەمز و سیمبوڵ نابێ، ئێمەی كوردیش سەرباری ئەوەی بواری ئەوە نەڕەخساوە لە ڕابردوودا ببینە خاوەن كیانێكی نەتەوەیی. بەڵام بەهۆی خەبات و فیداكاری و تێكۆشانی میللەتەكەمانەوە توانیومانە یەكێ لەو بنەمایانەی وەك نەتەوەیەكی زیندوو دەرمان دەخات، ڕەمزی نەتەوەییمان هەبێ. هەر لە ڕابەرانی شۆڕش و ڕاپەڕینەكانمان لە چەرخەكانی ڕابردوو تا قۆناغەكانی خەباتی ڕزگاری لە سەدەی بیستەمدا، بارزانی نەمر و مام جەلال وەك ڕەمز و سیمبوڵ بۆ نەتەوەكەمان دەربكەون. بێگومان ئەمەش پەیوەندی بە تێكۆشان و مێژووی پڕ لە فیداكاری ژیانی خۆیانەوە هەیە كە تەمەنیان بۆ خەبات لە پێناو ڕزگاری میللەتدا تەرخان كردووە.

ساڵی 1985 گفتوگۆی نێوان ی.ن.ك و حكومەتی عیراق شكستی هێنا، مام جەلال بەیانێكی بڵاوكردەوە لە بەیانەكەدا داوای لەهەموو هێزەكانی سەر گۆڕەپانی خەبات دژی ڕژێم كرد، گفتوگۆ بكەن بەرە و ئاشتبوونەوەی گشتی و پێكهێنانی بەرەیەكی یەكگرتوو و كۆتایی هێنان بەشەڕ و ناكۆكییەكانی ناوخۆ. ئێمە ئەوكات لەگەڵ كاك محەمەدی حاجی محمود بەرپرسی حزبی سۆسیالیستی كوردستان بووین، لە هەورامان

و شارەزور و شارباژێڕ، بە ووردی بەیانەکەی مام جەلال-مان تاوتوێ کرد و گەیشتینە قەناعەت کە بەرژەوەندی گەلەکەمان لەوەدایە کۆتایی بەشەڕی ناوخۆ بهێنین، پێشوازی لەو داخوازیە بکەین.

کارێکی ئاسان نەبوو بۆ ئێمە و هاوپەیمانەکانمان، بەڵام سەرئەنجام ناوی خوامان لێهێنا، بۆ یەکەمجار پاش ماوەیەکی زۆر لە شەڕی ناوخۆ و ناکۆکی و نەمانی هیچ جۆرە پەیوەندی و متمانەیەك، بە نوێنەرایەتی برادەران، سەردانی مام جەلال-مان کرد لە یاخسەمەر. زۆر بەگەرمی خۆی و برادەرانی پێشوازییان لێکردم، ماوەیەك میوانیان بووم و قسە زۆر کرا، سەهۆڵ بەندانەکە توایەوە، ئاشتبوونەوەی گشتی بوو بە ئەمری واقیع. هەموو لایەنەکان بەشداری گفتووگۆکان بوونەوە بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی.

مام جەلال ڕۆڵێکی گرنگی بینی لەو پرۆسەیەدا، هەروەها کاك نەوشیروان مستەفاش ڕۆڵی زۆر ئیجابی بوو، برادەرانی تری یەکێتیی هەموو گەرم و دڵسۆز بوون و لە لایەن پارتییش ڕەحمەتی کاك ئیدریس بارزانی و کاك مەسعود دەورێکی کوردانە و پڕ بایەخیان بینی. حزبی شیوعی و حزبەکانی تر ماندوو بوون لە هەوڵ و کۆششدا. ئێمە لە کۆبوونەوەکاندا چونکە لەسەرەتادا بەشداربووین هاوکار و دەوری نزیکبوونەوەمان دەبینی، کەسایەتی مام جەلال و توانای لە ئیدارەکردنی کۆبوونەوەکاندا، پرۆسەکەی بەرەو سەرخستن برد.

مام جەلال جگە لە تێکۆشان لەو ماوە دوورو درێژەدا بۆ بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان، ڕۆڵێکی

یەکجار گەورەی دەبینی لە دروستکردنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ عەرەب لە عیراق و لە دەرەوەی عیراق لەسەر بنەمای وەکیەکبوون و بەشداری کورد لە حوکمڕانی وڵات و وەك هاوڵاتی پلە یەك.! لەگەڵ شۆڤێنییە عەرەبەکاندا هەمیشە لە مشتومڕدا بوو، لەگەڵ دۆستەکان و ڕۆشنبیر و سیاسییە عەرەبەکان پردی برایەتی و دۆستایەتی پتەوی دامەزراند، گومانم لەوەدا نییە شۆڤێنییە عەرەبە ڕەگەزپەرستەکان ئارەزوویان وایە مام جەلال بەو شێوەیە بیری نەکردایەتەوە و کاری نەکردایە، بەڵام بیرکردنەوەی مام و پەیوەندی و دۆستایەتی و باوەڕی بە مەنتقی پێکەوەژیان وایکردووە، ئەوان لەبەرانبەر ئەو حیکمەتانەیدا هیچیان پێ نەمێنێ و بگەنە ئەو باوەڕەی بە سەمامی ئەمانی عیراقی ناو بەرن.

پەیوەندی مام بە سیاسی و ڕۆشنبیرانی عەرەب لە شەستەکانەوە تا ئەمڕۆ کاریگەریی خۆی بەجێهێشتووە، ژمارەی ئەو ڕۆشنبیر و سیاسییانە کەم نین ئێستا لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق داکۆکی لە داخوازییە ڕەواکانی گەلی کورد بکەن. ئەمەش بەشێکی زۆری بەرهەمی کار و ماندووبوونی ئەم پیاوە ماندوو نەناسەیە.

گەرچی چاوەڕوانی ئەوەم ڕۆژێك سەرجەم بیرەوەرییەکانی مام جەلال چاپ و بڵاو بکرانایەتەوە، بەڵام ئەم چەردە مێژووییەش بە گرنگ دەزانم کە ئێستا لە دووتوێی ئەم کتێبەدایە، بەتایبەت لە هەلومەرجێکی سیاسیی وەك ئێستای کوردستان و عیراقدا، ئەزموونی ژیانی مام جەلال دەبێتە مایەی پەند و سوود وەرگرتن بۆ خەباتی داهاتوومان. بۆیە بێگومانم لەوەی ئەم کتێبە بە بایەخەوە

دەخوێندرێتەوە و هەزاران خوێنەواری کورد بەرچاو ڕوونیان دەبێ لە خەباتی ڕزگاریخوازی کوردستان لەم قۆناغەی مام جەلال تێیدا بەشدار بووە و ئەم کتێبەش بە دڵنیایەوە کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردی پڕدەکاتەوە..

**محەمەد شاکەلی**

**سەرۆکی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەلایەتی کەرکوك**

2009/10/20

**کەرکوك**

## وتەیەك

ئەو هێندە کەمەی بیرەوەرییەکانی مام جەلال کە لە دووتوێی چەند دیدارێکدا لە ڕۆژنامەی «الشرق الاوسط» بە (10) ئەڵقە بڵاوکرایەوە و هاوکات ڕۆژنامەی ئاسۆ بەهەمانشێوە بە ئەڵقە بڵاویکردەوە، ئەگەرچی مشتێکە لە خەرواری خەبات و تێکۆشانی نەپساوەی ئەو پیاوە بە فیترەت هەڵکەوتووەی کورد و بەشێوەیەکی نیمچە سەرپێیی نزیکەی سی ساڵی لە تەمەنی سیاسی شەست ساڵەی ئەو سەرکردە لێهاتووەی تێدا ڕووماڵکراوە، بەڵام لە جەوهەردا لە چەند لایەنێکەوە بایەخێکی زۆری هەیە هەم بۆ پیاوانی سیاسی و هەم بۆ خوێنەران و ئەوانەش کە بەدوای بیرەوەری و یاداشتی گەورە کەسایەتییەکاندا دەگەڕێن.

مام جەلال وەك خۆی باسیدەکات هەموو بیرەوەرییەکانی لە (14) دەفتەری تێبینی گەورەدا نووسیوەتەوە و هێشتا بڵاوینەکردوونەتەوە، بەو پێیەشبێت ئەوەی لەم بەشانەدا خرانەڕوو، بەشێکی زۆر کەمی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی سەرکردەیەکی بە ئەزموون و سەردەمدیدەیە و لایەنی کەمی وردەکارییەکانی ئەو تەمەنە جەنجاڵ و پڕاوپڕە پیشاندەدات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بیرەوەریانە دەتوانن هیچ نەبێت کەلێنێکی بچووکی ڕووداوە ئاشکرانەکراوەکانی پشت پەردە بخەنەڕوو، هەندێك زانیاری ورد و بایەخدار ئاشکرابکەن کە پێشتر نەزانراون، کەمێك لە کەلێن و بۆشایی ڕاستیی ڕووداوەکان پڕبکەنەوە، وەرگر والێبکەن بەچاوێکی تیژتر

ڕووداو و بەسەرهاتەکانی میللەتەکەی بخوێنێتەوە و هەڵوێستی تەواوی کەسایەتییە کاریگەرەکان لەئاست گۆڕانکارییە گرنگەکانی ڕابردوودا تێبگات.

دەتوانم لە گرنگی ئەم بیرەوەریانەدا ئاماژە بەوەبکەم کە شتێکی دەگمەنە کەسایەتی وەك سەرۆکی وڵاتان لە ژیاندامابن و بێسڵەمینەوە توخنی بابەتێکی وەك گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانیان بکەون کە هەر زانیارییەکی چەندە بچووکیش بێت، بەندە بەتەواوی بوارەکانی ژیانی وڵاتەکە و کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەردادەنێت و دووریش نییە کێشە و گیروگرفتیش بەدوای خۆیدا بهێنێت، هەربۆیەش سەرکردە و کەسایەتییە بەناوبانگەکان، نووسینەوە و ئاشکراکردنی بیرەوەرییەکانیان دەخەنە کاتی دوای وازهێنان لە پۆستەکانیان یاخود خانەنشینبوونیان یان دانیشتنیان.

ئەم بیرەوەرییانە بایەخێکی دیکەیان لەوەدایە کە سەرۆکی وڵاتێك و حزبێکی گەورە دێت و ڕاستگۆیانە ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە کە لە ڕابردوویەکی نزیکدا لەگەڵیان ژیاوە، لەوەشدا خۆی نەبواردووە لە باسکردنی ئەو لایەنانەی ڕاستەخۆ پەیوەندییان بە کەسایەتی خۆی یاخود هەڵسوکەوتیەوە یان ئەندامانی خێزانەکەیەوە هەیە، لەکاتێکدا باسکردنی ژیانی تایبەتی سەرۆك و سەرکردەکان لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو یان خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، لە تابۆ و قەدەغەکراوەکانە، کەچی ئەم دێت و تەنانەت دڵفراوانە ئەو نوکتانەش دەگێڕێتەوە و کۆدەکاتەوە کە لەبارەی خۆیەوە وتراون.

بێگومان لە زۆر دیدار و چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسییدا مام جەلال کەم تا زۆر شتێکی لەبارەی ژیان و بیرەوەرییەکانی خۆی باسکردووە ئەوەش بەندبووە بە شارەزایی و لێهاتوویی ئەو ڕۆژنامەنووسەی دیدارەکەی لەگەڵ ئەنجامداوە، بەڵام وەك ئەوەی بەتایبەتی بێت و بە

نووسین یان هەر جۆرێکی دیکەی خستنەڕووی یادەوەری، ژیان و سەربووردەی ڕابردووی خۆی یاداشت بکات، هەرنەبووە و ئەگەر هەشبووبێت زۆر کەم بووە. ئەوەش کە لەم بیرەوەرییانەدا باسیدەکات و هەڵوەستە لەسەر هەر ڕووداو و قۆناغێکی تایبەتی ژیانی دەکات و بەو وردییەوە لەبارەیانەوە دەدوێت و قسە و گفتوگۆکانیش دەگێڕێتەوە، بۆ یەکەمجارە ڕوودەدات، ئەمەش بایەخێکی زیاتر بەهەر بەشێکی ئەو بیرەوەرییانە دەبەخشێت، چونکە ڕاستەخۆ لەزاری خودی کەسایەتییەکەوە بیرەوەرییەکان دەبیستین نەك لەڕێی ناوەندێکی دیکەوە، هەرئەوەشە زیندوویی و گەرموگوڕی پێبەخشیوون.

پێموایە ئەو هەڵمەتی درۆ و دەلەسە دروستکردنەش کە لەدوای بڵاوبوونەوەی بیرەوەرییەکان، لە دژی سەرۆك کۆمار بەرپاکرا، بەوەی پارەی لە بەرامبەر بڵاوکردنەوەیان داوە، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بایەخ و کاریگەریی بیرەوەرییەکانەوە هەبوو.

بەدرێژایی (21) ژمارەی ڕۆژنامەی ئاسۆ، ئەم بیرەوەریانە بوونە بابەتێکی سەرنجڕاکێش و پڕخوێنەر بۆ ڕۆژنامەکەمان و دەستخۆشی و ستایشی ئەو کارەیانکردین، هەر ئەمەشبوو هانیدام بیر لەوەبکەمەوە کە سەرجەم بەشە بڵاوکراوەکان لە دووتوێی کتێبیکدا بە چاپ بگەیەنم، بۆ ئەو مەبەستەش پەیوەندیم بە ڕۆژنامەنووس مەعد فەیاز ئامادەکاری دیدارەکانی «الشرق الاوسط»ەوە کرد کە ئەوکاتە لە لەندەن بوو تا وەك ماف خۆی مۆڵەتی بڵاوکردنەوەیم پێبدات، ئەویش وێڕای دەستخۆشی و قرساندنی ئەو وەرگێڕانە بەخۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی چاپکردنی کتێبەکەی دەربڕی و ئەوەشی ئاشکراکرد کە ئەم بەشانەی بڵاوبوونەتەوە تەنیا بەشێکی ئەو دیدار و چاوپێکەوتنانەیە کە لەو ماوەیەی لەنزیك مام جەلال بووە ئەنجامیداون و بەنیازە لە داهاتوودا بەهاوکاری دکتۆر فوئاد مەعسوم

سەرجەمیان وەك كتێبێك لەبارەی بیرەوەرییەكانی سەرۆك كۆماری عێراق چاپ و بڵاوبكاتەوە و ڕەزامەندی ئەوەشی بۆ دەربڕیم تا ئەو كتێبەش بەهەمانشێوە وەربگێڕمە سەر زمانی كوردی.

هەر بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم كتێبە بەنرخە كە بەشێك لە بیرەوەرییەكانی مام لەخۆدەگرێت، هەوڵمدا كەسێك بدۆزمەوە كە هاوسەردەم و نزیك بووبێت لە مام جەلالەوە بۆ ئەوەی هەندێك بیرەوەری خۆی لەگەڵدا بنووسێت، خۆشبەختانە مامۆستا عەبدولكەریم شێخانی كە هاوپۆل و هاوڕێی خوێندنی مام جەلالە ئامادەیی دەربڕی كە هـــــەندێك لە بیرەوەرییەكانی خۆی لەگەڵ مام جەلالی هاوڕێ و خوێندكاردا بۆ كتێبەكە بنووسێتەوە.

**وەرگێڕ**

## دەروازە

مام جەلال ئەمڕۆ وەك لەسەر ئاستی کوردستان سیاسەتمەدارێکی ناودار و لێهاتووە، لەسەر ئاستی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتیشدا هەمان قورسایی و کاریگەریی هەیە و گەلێك لەو ڕووداوە ئیجابیانەی ئەمڕۆ لە مەیدانی سیاسی ناوخۆ و دەرەوە ڕوودەدەن، بە دڵنیاییەوە دەڵێم، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، شوێن پەنجەی ئەویان پێوە دیارە.

ئەو زاتە کە تەمەنی خەباتی لە شەست ساڵ زیاترە و زۆر لە تەمەنی ڕاستەقینەی هەندێ تازە پێداکەوتوودا زیاترە و (عرفان قانعی فرد) لە کتێبێکی هەزار لاپەڕەییدا کە بەرگی یەکەمە بە فارسی و بە ناونیشانی (پس أز شصت سال زندگی و خاطرات جلال طالباني) بڵاویکردۆتەوە، گەورەیی ئەو خەباتگێڕە دەردەخات، ئەوەی من لێرەدا دەڵێم باسکردنی واقیعێکە، خستنەڕووی ڕاستییەکە کە شاردنەوەی لە توانای کەسدا نییە، تەنیا مەگەر ئەوانەی چاویان بە ڕووناکیی هەڵنایە.

ئەم ناودارییەی ئەمڕۆی مام جەلال وەنەبێ زادەی ماوەیەکی کەم بێت و لە پڕێك بووبێت بە کوڕێك، بەڵکو مەڵۆ بە مەڵۆ خستوویەتیە سەر خەباتی تێکۆشانی تا بووە بەو جۆخینەی ئەمڕۆ بووەتە خۆراکی بیری کوردایەتی و کۆڵنەدان.. ئەو لە ڕۆژگارە سەختەکاندا بەرد بەرد و چین چین بناغەی دیواری خەبات و شۆڕشی داڕشتووە تا بووەتە ئەو قەڵایەی ئەمڕۆ لە داڕمان و هەرەس هێنان نایە و ئەوەندەی من ئەو زاتە بناسم، ڕۆژێك لە ڕۆژان سڵی لە ئەوپەڕی قوربانیدان نەکردۆتەوە، بۆیە ئەمڕۆ

نەك تەنیا دۆست، بەڵکو دوژمن و ناحەزانیش دان بەو ڕاستییەدا دەنێن و پێش ئەوەی هیچ هەنگاوێك بهاون، یان ورتەیەك لە دەمیان بێتە دەرەوە، حیسابێکی وردی بۆ دەکەن، بۆیە لەم ڕووەوە ئاماژە بە شیعری شاعیرێکی عەرەب دەکەم کە بۆ ستایشی یەکێك نووسیویەتی و ئەو شیعرە دەڵێی دەقاودەق بۆ مام جەلال گوتراوە:

فأنك شمس والاخرون كواكب

فأذا بدوت لم يبد منهن كوكب

واتە: تۆ خۆریت و ئەوانی دیکە هەسارەن،

بۆیە کە تۆ دەرکەوتی، ئەوانی دیکە دیار نامێنن

من بەم قسانەم نامەوێ ستایشی مام جەلال بکەم، چونکە ئەو زۆر لەوە گەورەترە کە بە قسەی من گەورە بێت و لەهەمان کاتیشدا قسەی هیچ کەسێك و لە هەر ئاستێکدا بێت تۆزقاڵێك لە نرخی مام جەلال کەم ناکاتەوە و شێخ ڕەزا گوتەنی:

"مێشوولە نەچێ چاکە بەگژ قوللەیی قافا"، چونکە ئەوەی بۆ سەرکردە کوردەکانی دیکە نەهاتەدی و بوارە سیاسییە ئاڵۆزەکە بارودۆخەکەی لێ ئاڵۆز کردن، مام جەلال بە وریایی و زیرەکی و لێوەشاوەیی خۆی هێنایە دی.

کە یادەوەرییەکانی مام جەلالم بە کوردی خوێندەوە ئەوەی برای بەڕێز کاك سۆران عەلی لە ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)ەوە کردوویەتی بە کوردی و ڕۆژانە لە ڕۆژنامەی (ئاسۆ)دا بڵاو دەکرایەوە، زۆر جار مام جەلال منیشی دەگەڕاندەوە بۆ سەردەمی منداڵی و سەرەتای فێربوونی سیاسەت، بەتایبەتیش بیری کوردایەتی..

لە ناوەڕاستی جەنگی دووەمی جیهانی و دواتریش پاش کۆتایی هاتنی ئەو جەنگە شووم و ماڵ وێرانکەرە و سەرهەڵدانی جۆرە بیر و باوەڕێکی پێشکەوتنخوازانە و دامەزراندنی کۆماری مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و دوای ئەوەش دروستبوونی پارتی دیموکراتی

کوردستان لەسەر داروپەردووی حزبی هیوا لە باشووری کوردستان و کۆمەڵەی (ژ.ك) ژیانەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

لەو سەردەمەدابوو کە (مەکتەبەی حاجی قادری کۆیی) لە کۆیە کرایەوە وەك مەڵبەندێکی ڕۆشنبیریی سەر بە پارتی دیموکراتی کورد (ئەوسا ناوەکەی وابوو) و ئەوەندەشی پێنەچوو کە مەکتەبەی کۆیە (کۆیسنجق) کرایەوە و لە ئەنجامی کۆمەڵە کارلێکێك کە لەنێوان کۆمەڵە و ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکاندا دروستبوو، ئەو ڕەوتە چەپە لەنێوان کۆمەڵێك ڕۆشنبیری کورددا بڵاوبوەوە لە ئەنجامی سەرکەوتنی یەکێتی سۆڤیەت و هاوپەیمانانی بەسەر ئەڵمانیای نازی و ئیتاڵیا و ژاپۆن و هاوپەیمانیاندا، مەکتەبەی کۆیە مەڵبەندی کۆبوونەوەی ئەو کۆمەڵە ڕۆشنبیرانە بوو کە لە پارتی دیموکراتی کورد و حزب و کۆمەڵە کوردییەکانی پێش ئەو جیابوونەوە و خۆیان لە حزبی (التحرر الوطني) کە ڕوویەکی ئاشکرای حزبی شیوعی عیراق بوو، نزیك کردەوە و بە کردەوەش داکۆکییان لە حزبی شیوعی و بیروباوەڕەکەی دەرکرد.

پێش ئەوەی درێژە بەم پێشەکییە پێویستە بدەم کە دەروازەیەکی گرنگە بۆ چوونە ناو باسەکە، کەمێك لاڕێ دەبم و دەگەڕێمەوە بۆ سەردەمی منداڵی و قۆناغی خوێندنی سەرەتایی.

ئێمە کۆمەڵێك قوتابی بووین بەهۆی لەخۆ گەورەترەکانمان بیر و باوەڕی کوردایەتی لە مێشکماندا چەکەرەی کردبوو، هەر لەو سەردەمەشدا ئەو بیر و باوەڕە چەپە کە تازە بوو، لای هەندێ قوتابی، بەتایبەتیش قوتابییانی ناوەندیی کۆیە سەری هەڵدابوو و ئەوانە خۆیان لەو قوتابییانە نزیك دەکردەوە کە جۆرە جموجولێکی سیاسیی پێڕەوکەیان هەبوو، بۆ نموونە وەك ئێمە، دەیانویست ئێمەش بەرەو ئەو ڕێبازە بەرن، مامۆستاکانمان کە زۆربەی زۆریان لەنێو کۆمەڵە و حزبە کوردییەکاندا کاریان دەکرد و تێیدا قاڵ بووبوونەوە گەلێك بە هێما بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئامۆژگارییان دەکردین کە بە قسەی هەندێ کەس

هەڵنەخەڵەتێین و لێیان نزیك نەبینەوە و ئەو ئامۆژگارییەیان زۆرجار دووبارە دەرکردەوە، بۆیە کە مەکتەبەی حاجی قادری کۆیی لەنێو بازاڕەوە گوێزرایەوە بۆ دوکانێك بەرانبەر دەرگای دەرەوەی مزگەوتی گەورەی کۆیە و پاڵی دابوو بە پشت یانەی فەرمانبەرانەوە، ئێمە هامشۆی ئەو مەکتەبەیەمان دەکرد و ڕۆشنبیرە ناودارەکانی کۆیەمان لەوێ دەبینی بەتایبەتی کاك عەلی عەبدوڵڵا.

من و مام جەلال و چەند قوتابییەکی دیکە ڕۆژانە ئەگەر دەرفەت هەبوایە دەچووینە مەکتەبە و لەوێ دادەنیشتین و هەندێك لە مامۆستاکانمان دەهاتنە ئەوێ و لە گەلێك بابەتەوە دەدوان و ئێمەش گوێمان لێدەگرتن. چوونمان بۆ مەکتەبەی حاجی قادری کۆیی قۆناغی دووەمی هاوڕێیەتیمان بوو لەگەڵ مام جەلالدا.

ماڵی ئێمە و ماڵی مام جەلال کە لەناو تەکیێی تاڵەبانییان لە پشتی کۆلانی مەحکەمەوە بوو، زۆر لە ماڵەکەی ئێمە دوور نەبوو، لەبەرئەوە ڕۆژانە من هەڵدەکشام بۆ شوێنێك کە وەك ناوەڕاستی ماڵەکانمان بوو لە بۆشایی نێوان مزگەوتی مەحموداغا و ماڵی سمایلاغا، ئیدی هەموو ڕۆژێك، بەتایبەتی هاوینان یان ڕۆژانی هەینی لەوێ کەلایانێمان (هەڵماتێنمان) دەکرد و زۆرجار دەبوو بە مووشێن. تەنانەت لەوەشدا مام جەلال پیتکەی لە هەموومان ڕاستتر بوو و بە زۆریش دەیبردەوە.

هامشۆی مام جەلال بۆ مەکتەبەی حاجی قادری کۆیی سەرەتای قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی ئەو زاتەدا، چونکە بازدانێکی جۆرایەتییە لە شێوەی بۆچوون و بیرکردنەوەی ئەو سەردەمەیدا، بەتایبەتی کە هاوینان، چونکە دەرفەتەکەمان وەك قوتابی زیاتر بوو، بەشی زۆری کاتەکانی خۆمان لە مەکتەبە بەسەر دەبرد و هەندێك لە مامۆستایانمان دەهاتن بۆ ئەوێ و زۆرجار بە هاتنی برادەرانی سەر بە (مەکتەبەی کۆیە) بۆ نموونە وەك خوا لێ خۆشبوو (فاتح ڕەسول) و (عوسمان مستەفا خۆشناو) کوڕی

گفتوگۆ گەرم دەبوو، بەتایبەتی ئەوان وەك هەڵگری بیر و باوەڕی مارکسیزم، خەباتی چینایەتییان بە بەردی بناغەی تێکۆشان دادەنا نەك خەباتی نەتەوەیی.

مام جەلال هەندێ جار بە دەق بەشێکی زۆری ئەو مشتومڕەی لەبەر دەکرد و لە گەلێك بۆنەدا لەگەڵ هەندێ لەو برادەرانە پێی دەگوتنەوە.

بیرمە، جارێکیان لە چایخانەیەکی هاوینە دانیشتبووین کە پشتی بە پشتی هەندێ ماڵی گەڕەکی جوولەکانەوە بوو، هەر لەگەڵ خوا لێ خۆشبوو (فاتح ڕەسول)دا، موجادەلەیان دەکرد، کاك فاتح دیسان چەقی لەسەر خەباتی چینایەتی بەستەوە و گوتی: (نضال نضالی طبقي)یە، کەچی مام جەلال گوتی: نەخێر بۆ ئێمە (نضال نضالي جماهيري)یە، چونکە ئێمە وەك نەتەوە دەچەوسێنرێینەوە و کرێکاری کوردیش وەك چینی کرێکار، کەواتە ئێمە دووجار دەچەوسێنرێینەوە.

نازانم نەورۆزی 1946 بوو، یان 1947 بوو، ئەو ساڵە نەورۆز لە (شاخی مشکەی)کرا، لەو نەورۆزەدا شانۆ و شت دروست نەکرابوو، بەڵکو چەند ڕادیۆیەك لەوانەی بە پاتری تەڕ (پاتری ئۆتۆمۆبیل) کاردەکەن میکرۆفۆنەکانیان بە وایەر جەلە کرابوون (پێکەوە بەسترابوونەوە) و دەنگەکە بۆ هەموو ڕادیۆکان دەچوو و خەڵکێکی زۆریش دانیشتبوون، بەڵام بەداخەوە ڕادیۆکان دەنگیان ئەوەندە بەرز نەبوو ئەوانەش کە وتار، یان شیعریان دەخوێندەوە لە بەرانبەر یەکەم ڕادیۆدا دادەنیشتن و قسەیان دەکرد و بەتەواوەتیش لە خەڵکەکەوە دیار نەبوون.

ئەو سەردەمە جۆرە باجێکیان لەو لادێییانە دەستاند کە دار و چیلکە و کایان دێنا بۆ فرۆشتن بەو باجەیان دەگوت (استهلاك) و کابرای لادێیی ئەوەندەی لە نرخی فرۆشتنەکە بۆ نەدەمایەوە. خوا لێ خۆشبوو کاك (عەونی) شاعیر دەمە تەقێیەکی لەنێوان گەنج و پیرەمێردێکی لادێ

نشین نووسیبوو. کابرای پیره لە شار گەڕاوەتەوە و لاوەکە باسی شاری لێدەپرسێ، من پیرەمێردەکە بووم و مام جەلالیش لاوەکە. بەداخەوە من بەشەکەی خۆمم بەتەواوەتی لەبیر نەماوە و ناشزانم مام جەلالی برا و هاوڕێ بەشەکەی خۆی لە بیرە یان نا، چونکە بەلای کەمەوە زیاتر لە شەست ساڵ بەسەر ئەو بەروارەدا تێپەڕیوە، لە وەڵامی ئەودا دەڵێم:

ڕۆڵە وادیارە تۆ هەرزەکاری
چۆن بێ خەبەری لە باسی شاری
یاخوا کاولبێ ئەوشارەی کەوا
پڕبێ لە زوڵم و جەور و زۆرداری

***

هەر دوور لە شار، هەر دەربەدەربە
بۆ دیتن کوێربە و بۆ بیستن کەڕبە
بەداخەوە دوو دێڕەکەی دیکەم لەبیر نەماوە.
ئینجا لە چوارینەیەکی دیکەدا دەڵێم:
بۆت بگێڕمەوە دەنگ و باسی شار
دووبارم پێ بوو، یەك کا بوو، یەك دار
هەردووکم فرۆشت بە ڕوبعێ دینار
باجیان لێسەندم سێ تەقسیم چوار

یەکەم دەرکەوتنی جەماوەریی مام جەلال لەو کۆبوونەوە گەورەیە بوو کە لە مزگەوتی گەورەی کۆیە بە بۆنەی چلەی شەهیدانی ڕاپەڕینە مەزنەکەی کانوونی دووەمی ساڵی 1948 سازکرا، ئەو ڕاپەڕینە بوو بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەکەی نێوان ساڵح جەبری سەرۆك وەزیرانی عیراق و مستەر بێفن-ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بۆ پینەکردنی پەیماننامەی 1930ی نێوان عیراق و بەریتانیا بەسترا و چەند کەسێك شەهید بوون، لەوانە (جعفر الجواهري) برای شاعیری مەزنی

عیراق (محمد مهدی الجواهري). بۆ یەکەم جار جوولەکە و دیانەکان (مەسیحییەکان) پێیان نایە ناو مزگەوتی گەورە، مام جەلال لەو کۆبوونەوەیەدا وتارێکی بەنرخ و توندی خوێندەوە و خوا لێ خۆشبوو (عەونی)ش شیعرێکی جوانی خوێندەوە کە بە داخەوە تەنیا یەك دێڕیم لەبیر ماوە:

ئەوانە پێیان دەڵێن مەجلیسی میللەت

بە لەعنەت بن بە لەعنەت بن، بە لەعنەت

لە قوتابخانەی ناوەندیدا، ژمارەی هەرسێ پۆلەکە لە حەفتا هەشتا کەس تێ نەدەپەڕی، قوتابییەکان تێکڕایان پارتی یان (تحرر) واتە شیوعی بوون. کەس نەبوو بێ لایەن بێت، تەنیا مەگەر کوڕە فەرمانبەری دەرەوەی کۆیە کە لە شارەکانی دیکەوە دەهاتن.

ڕۆژێکیان خۆپیشاندان بوو، هەموومان بەشداریمان کردبوو تەنیا تاقە کەسێك نەبێ ئەویش کوڕی (مأموري استهلاك) بوو و تورکمانی خەڵکی کەرکوك بوو. ئەو بەتەنیا دەوامی کردبوو و قوتابییەکان لێیان لە هەڵڵادا و مەحموداغای کاکە زیاد بە تەواوەتی لێی توڕە بوو، ئەو قوڕ بەسەرە هیچ نەزانە نەیدەزانی بڵێ چی.. سەرەنجام گوتی: (وەڵڵا بابە ئەمن نەزانمە سەورەیە). ئەو سەردەمە مامۆستا کەریم ئەحمەد مامۆستامان بوو، بێگومان ئەو شیوعی بوو و ئەوساش و ئێستاش ڕێزی زۆرم بۆی هەیە، چونکە بەڕاستی مامۆستا بوو، بەڵام بمانەوێ و نەمانەوێ کەمێك بەلای قوتابییە شیوعییەکاندا دایدەشکاند، لە پۆلی دووەمی ناوەندی بووین، لە پۆلدا وانەی مامۆستا کەریمان هەبوو، دیسان کۆڕی موجادەلە گەرم بوو و هەر وەك جاران سەرە گلۆڵەکە لای مام جەلال بوو. قسە هاتە سەر هەقی کورد بۆ پێك هێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ و مافی چارەی خۆ نووسین، مام جەلال ئاماژەی بە وتەیەکی لینین کرد کە دەڵێ مافی چارەی خۆ نووسین مافی سروشتی هەموو

گەلێکە دەبێ هەوڵی بۆ بدات تەنانەت ئەگەر لە هەزار جاردا، جارێك سەرکەوێ.

بەڵام مامۆستا کەریم گوتی: ئەو وتەیەی لینینی بەجۆرێکی تر لێك دایەوە.

مامۆستایەکی عەرەبی شیوعی زمانی عەرەبیمان هەبوو ناوی (عبدالکریم شاکر الاعظمي) بوو، چوون بۆلای ئەو بۆ لێکدانەوەی وتەکەی لینین و ئەویش لایەنی قسەکەی مام جەلالی گرت.

ئەوکاتانەی ڕۆژەکەی خۆش بوایە، بەتایبەتی بەهاران کە ڕۆژ کەمێك درێژ بوو، دوای نیوەڕوان لە قوتابخانە دەهاتینەدەر و کۆمەڵێك قوتابی لەگەڵ مام جەلالدا دەڕۆیشتین بەرەو (تاتووکان) کە شوێنێکە لە کۆیە و ئێستا هەمووی بووەتە خانوو و لەوێوە سەردەکەوتین بۆ گردەکەی سەرەوە ئینجا دادەنیشتین و بە کۆمەڵ باسی بابەتێکی دەهێنایە گۆڕێ و بۆی شی دەکردینەوە. هەندێك جار بڵاوکراوەی حزبیی تازە دەرچووی دەخوێندەوە و هەندێك جاریش شتی دیکە. بیرمە یەکێك لەو شتانەی کە بۆی باسکردین پێشەکییەکەی نامیلکەی (المادية الدياليكتيكية والمادية التاريخية) بوو کە (خالد بکداش)ی کوردی سکرتێری حزبی شیوعی سوریا وەری گێڕابوو پێشەکی بۆ نووسیبوو.

هەتا سێیەمی ناوەندی بە یەکەوە بووین و لە یەك شانەی حزبی بووین ئەو ڕێکخەرمان بوو و ئەو سەردەمە گەیشتبووە لیژنەی ناوچە. جگە لە مام جەلال سێ کەسی دیکە بووین، من، کەمال قادر، محەمەد صادق، کە ئێستا هەرسێکمان نیشتەجێی سلێمانین.

جارێکیان نامەیەکم بۆ مام جەلال نووسی، بەڵام ئەوەی بۆی برد، نەی گەیاندبوو، نووسیبووم: ئێستا هەرسێ ئەندامەکەی دیکەی حزب لێرەین، ڕەنگە ناو بەناو، با دووریش بێ، بە یەك بگەین و شەن و کەوی یادگاری

و کۆبوونەوەکانی ئەو سەردەمە بکەین، بە خەیاڵ بمانگێڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرەتای لاوی.

هەموو شەوێکی هەینی لە ماڵی ئەوان کۆبوونەوەی حزبیمان هەبوو. ئەو سەردەمە کارەبا لە کۆیە نەبوو و خەڵکی لە بەر چرای نەوتی دادەنیشتن و هەموو شەوێ، بەتایبەتی زستانان، دوای بانگی خەوتنان، دەنووستن و ئێمەش لەبەر ئەوەی کۆبوونەوە درێژەی دەکێشا، ناچار دەبووین تەق و هوورِ لە دەرگا بدەین، چونکە هیچ ماڵێك زەنگی نەبوو، تا دەرگامان لێبکرێتەوە، بۆیە ڕۆژێکیان پێشنیازمان کرد کە کۆبوونەوە ڕۆژانی هەینی بێ. مام جەلال گوتی: ئاخر بەڕۆژ باش نییە و ئاشکرا دەبین.. تا لە ئەنجامدا ڕازی بوو کە ڕۆژانی هەینی لە ماڵی ئەوان کۆببینەوە. یەکەم هەینی کە چووین، من و کەمال قادر بووین، کاکە سووری شێخ عیززوڵڵا کە خزمی مام جەلال بوو و پیاوێکی وریا و قسەزان بوو، لە حەوشەکەی تەکێ چاوی پێمان کەوت و گوتی:

"Oh, we have meeting to day" واتە: "ئۆه، ئەمڕۆ کۆبوونەوەمان هەیە." کە بۆ مام جەلالمان گێڕایەوە گوتی: "نەمگوت ئاشکرا دەبین؟" ئیدی لەوە بەدواوە کۆبوونەوەکانمان هەر شەوانە بوو.

بەو شێوەیە ماینەوە... بارودۆخی سیاسیی عیراق ڕوو لە خراپی بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی حکومەتی (نوری السعید) بە بیانووی پارێزگاری کردن لە سوپای عیراق کە نێررابوو بۆ فەلەستین و شەڕی نێوان جوولەکە و عەرەب دەستی پێ کردبوو و دەوڵەتە عەرەبییەکان سوپایان ناردبوو بۆ فەلەستین پاش ئەوەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری دابەش کردنی فەڵەستینی دا بۆ پێك هێنانی دوو حکوومەت، یەکێك بۆ جوولەکە و ئەوی دیکە بۆ فەلەستینییەکان، بەڵام عارەب بەوە ڕازی نەبوون، سوپایان نارد بۆ فەلەستین بۆ ئەوەی وەك هەندێکیان دەیانگوت جوولەکەکان بخەنە دەریای ناوەڕاستەوە. وەکو گوتم: (نوری السعید)ی

سەرۆك وەزیرانی عیراق و دۆستی هەرەنزیکی بەریتانیاییەکان بەو بیانووە جاڕی (حوکمی عورفی) دا لە عیراق بۆ ئەوەی بزووتنەوەی نیشتمانیی لە عیراقدا سەرکوت بکات و نیشتمانپەروەران ڕەوانەی کونجی تاریکی بەندیخانەکانی عیراق بکات.. بۆیە بەگشتی چالاکی حزبی جۆرە خۆپاریزییەکی بەسەردا کشا و ئەوەی جاران کەمێك بە ئاشکرا دەمانکرد، خۆمان لێ دەدزیەوە.

هەر لەو سەروبەندەدا بوو، مامۆستا کەریم ئەحمەدی تێکۆشەری پێشکەوتنخواز، لە کارەکەی وەك مامۆستا (فەسڵ) کرا، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئێش و ئازاری گەلەکەی خۆیدا بوو، بۆ بژێوی خۆی دەستی کرد بە کرێکاری و لەگەڵ ئەو کرێکارانەدا کاری دەکرد و تەشتە گەچی دەگواستەوە، کە تا دوێنێ وەك مامۆستایەکی دڵسۆز ئاڕاستەی دەکردن و بەرەو تێکۆشان هانی دەدان.

لە پۆلی دووەمی ناوەندی، مام جەلال دیسان لە تاقیکردنەوە بەخشرا، چونکە تێکڕای نمرەکانی لە 85٪ زیاتر بوو و بە یەکەم دەرچوو بۆ پۆلی سێیەم و منیش تێکڕای نمرەکانم 85٪ بوو، بێ تاقیکردنەوە بە دووەم دەرچووم. ئەوەی ڕاستی بێ مام جەلال لە گشت وانەکان باش بوو بەتایبەتی بیرکاری و لەبەر ئەوەیش کە زۆری دەخوێندەوە عەرەبییەکەی زۆرباش بوو، هەروەها لە (قواعد)ی زمانی عەرەبیش دوو مامۆستای عەرەبمان هەبوو، یەکێکیان عەرەبیی پێ دەگوتین و لە پێشەوە باسمکردووە کە ناوی (عبدالکریم شاکر الأعظمي) بوو، بە بیروباوەڕ شیوعی بوو. ئەوەی دیکەیان ناوی (صاحب علوان حداد) بوو ئەویش بە بیروباوەڕ هەر شیوعی بوو و ئەندامی (حزب الشعب) بوو کە خەباتگێڕ و تێکۆشەری ناوداری مارکسیست (عەزیز شەریف) سەرۆکی بوو. ئەو دوو مامۆستایە لە بەغداوە بۆ کۆیە دوورخرابوونەوە. ئەوەی دووەمیان (کیمیا و ئەحیا)ی پێ دەگوتین کە

لەو ڕشتەیەدا تایبەتمەند بوو، بەڵام لەبەرئەوەی مامۆستای ئینگلیزیمان نەبوو، وانەی ئینگلیزیشی پێ دەگوتین. ئێمەش هەندێکمان لەگەڵ مام جەلالدا هەوڵمان دەدا زمانی ئینگلیزیمان بەهێز بکەین و بۆ ئەو مەبەستەش کێ بەرکێمان دەکرد بۆ لەبەرکردنی زۆرترین وشەی ئینگلیزی کە لە فەرهەنگی ئینگلیزی – عەرەبی گیرفان دەرمان دەهێنان و لە بەرمان دەکرد و بۆ ڕۆژی دواییش لە یەکترمان دەپرسییەوە.

جگە لەو دوو مامۆستایە مامۆستایەکی جوولەکەی بەغداییمان هەبوو، بیرکاری پێ دەگوتین. هەر لەو سەروبەندەدا گازینۆیەك لە کۆیە کرایەوە کە دەرگاکەی کەمێك لەولای (مەکتەبی حاجی قادر)ەوە بوو، کابرایەکی جوولەکەی بەغدایی بەڕێوەی دەبرد ناوی (ئەلیاهوو) بوو. ئێمەی قوتابی هامشۆی ئەو گازینۆیەمان دەکرد کە جگە لە یاریی کاغەز و تاوڵە، بۆ یەکەم جار بوو شەترەنج و یاریی مار و پەیژە ببینین، ڕۆژێکیان وەك جاران لە گازینۆکە دانیشتبووین و یاریشمان دەکرد، ئەوەندەمان زانی مامۆستا (صاحب علوان) و (سابیر ئیسماعیل)ی نووسەری دادگای کۆیە کە هەر خەڵکی کۆیەش بوو، خۆیان کرد بە گازینۆکەدا و ئێمەش لە حاڵەتێکدا بووین کە ئەگەر بەڕێوەبەری قوتابخانە کە کۆنە ئەفسەرێکی سەردەمی عوسمانی مووسڵاویی مێشك وشك بوو، ئێمەی لەو حاڵەتەدا بدیایە کە یاریمان دەکرد، بێ سزا دەرنەدەچووین، نووسەری دادگا بە مامۆستاکەمانی گوت: "شوف أستاذ طلابك گاعدین بالگازینو". کەچی مامۆستاکەمان دەمی ئەوی داخست و گوتی: "مایخالف، الدیمقراطیة في التطبیق".

هەروەها شتێکی دیکەم لەبیرە هەر بۆ خۆشی دەیگێڕمەوە. جارێکیان مام جەلال لەگەڵ برادەرێکدا تاوڵەی دەکرد و هەوڵی دەدا

زارەکە بگریٚ. برادەرەکە پیٚی گوت: مام جەلال ئەوە زار دەگری؟ مام جەلالیش لەوەلاّمدا گوتی: ئەی خۆم تەسلیمی قەدەرکەم.

کە لە پۆلی سیٚی ناوەندیی دەرچووین، من سالیٚك لە خویٚندن دواکەوتم، مام جەلال لە هەولیٚر لە پۆلی چواری دواناوەندیی دریٚژەی بە خویٚندن دا. بۆ سالی دواتر منیش چووم بۆ هەولیٚر، بەلاّم مام جەلال چوو بۆ کەرکوك و پۆلی پیٚنجەمی لقی زانستی لەویٚ تەواوکرد. بەریٚوەبەری دواناوەندیی مامۆستا (عوسمان قوجە)ی هەولیٚری بوو، پیاویٚکی باش، بەلاّم حەزی بەو قوتابییانە نەدەکرد کە سەروساختیٚکیان لەگەل سیاسەتدا هەبوو. کە بڕوانامەکەم دایە دەستی و سەیری کرد و زانی لە ناوەندیی کۆیەوە دەرچووە، گوتی: بەرخم حوسنی سلوکم لۆ بینە. گەواهینامەی (حسن السلوك) لە فەرمانگەیەك وەردەگیرا لە بەغدا کە ناوی (الشعبة الخاصة) بوو، بۆ ئەوەی ئەو کەسە بیسەلمیٚنیٚ کە (سلوکی سیاسی) هیچ گەردیٚکی لەسەر نییە و تەنیا لەو کەسانە داوا دەکرا کە دەچوونە (خانەی سەرەتایی مامۆستایان) و (ئامادەیی کشتوکالّ) و هەرگیز بۆ دەوام کردن لە قوتابخانەی دواناوەندیی داوا نەدەکرا. منیش گوتم: مامۆستا ئەی ئەوە نییە لە بڕوانامەکەم نووسراوە "وإنه من ذوي السلوك الحسنة"، گوتی: "بەرخم ئەتوو کۆیی وەکو (جەلال حسام الدین) ئاین و ئۆینم لۆ پەیا مەکە".

ئەو هاوڕیٚ قوتابییانەی کە سالی پیٚشوو لەگەلّ مام جەلال بوون باسی زیرەکی ئەویان دەگیٚڕایەوە.

کتیٚبیٚك هەبوو لە پۆلی چواری زانستی و ئەدەبی دەخویٚندرا و بەشی دووەمیشی لە پیٚنجی ئەدەبی دەخویٚندرا بەناوی (أحوال العراق) کتیٚبەکە بەگشتی باسی بارودۆخی عیراق و میٚژووی تازەی ئەو ولاّتەی دەکرد. ئەو کتیٚبە بۆ تاقیکردنەوەی گشتی (بەکالۆری) داخلّ نەبوو.

هاوڕێکانی مام جەلال گوتیان: هەموو جارێك لە تاقیکردنەوەی مانگانە یان نیوەی ساڵ و سەری ساڵ، مام جەلال (100)ی وەردەگرت. یەکێکیان گوتی: لە مامۆستاکەمان پرسی، ئاخر چۆن لەو وانەیەدا (100) وەردەگیرێ، مامۆستاکە گوتی: "مو هو یعرف أحسن من الکتاب".

هەر لەو ساڵەدا (انشقاقێك) لەنێو ڕیزەکانی پارتیدا دروست بوو کە پارێزەری بەناوبانگی ناوچەی بادینان (صالح روشدی) سەرۆکایەتیی دەکرد، ئێمە چەند کەسێك وەکو خوا لێ خۆشبوو وریا کانی مارانی، ئەحمەدی عەلی مەحمودی کاکەخان و چەند کەسێکی دیکە لەگەڵ ئەو ڕەوتە خوا دابڕکردووە بووین و لە کۆیەش (خالد دلێر) و چەند کەسێك لەگەڵ ئەو ڕەوتە بوون، لە هەولێر ڕۆژێکیان پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێ بڵاوکراوەیەکی حزبی ببەم بۆ کۆیە. کاتەکە زستان بوو و ئەو کاتە تەنیا پاسی تەختە دەچوو بۆ کۆیە. منیش بڵاوکراوەکەم شاردەوە و چووم بۆ کۆیە لە ڕێگا پاسەکە لە قوڕ چەقی و شەو لەناو پاسەکە ماینەوە، بۆ سبەینێ چووم بۆ کۆیە، سەرەتا هاوڕێکانم بەخێرهاتنێکی گەرمیان لێ کردم، بەڵام دوای ئەوە کە منیان لەگەڵ خالد دلێر بینی جنێوبارانیان کردم و ئەو خۆشیی بەخێرهاتنەیان لە کونە تفنکان هێنامە دەرێ.

دوای ئەوەی بە ماوەیەك پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێ بچم بۆ کەرکوك لەگەڵ دوو کەسی دیکە چاوم بە مام جەلال بکەوێ بۆ دانوستان سەبارەت بە یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکە. لە ئوتێل مەرکەزی دابەزیبووین، مام جەلال هات و کە چاوی بەو دوو برادەرە کەوت، گوتی: کەریم، ئێمە هەرچی هەمانە و نیمانە، بەشێکی زۆرمان لە کەرکوك کۆکردۆتەوە و لانەی گرنگی حزبمان لێرەیە و ئاماژەی بۆ یەکێك لەو دوو برادەرە کرد و گوتی: دەترسم لەم لا و لەو لا باسی بکات و گیروگرفت و دەردی سەریمان بۆ دروست بکات، لەبەر ئەوە ناتوانم بتان بەمە ئەو شوێنانە. بۆیە ئێمە

ناچاربووین بگەڕێینەوە و دوای ئەوە وەفدێکی دیکە پێکەوە دانیشتن و لەسەر یەك گرتنەوە ڕێککەوتن و ناوی حزبیش گۆڕا بۆ (پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان).

کە لە بەغدا دەمخوێند، ئەوسا مام جەلال لە پۆلی دووەمی کۆلێجی (حقوق) بوو، گەلێك جار دەمبینی و بڵاوکراوەی حزب و بڵاوکراوەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی دەدامێ کە ئەو خۆی بەرپرسی بوو.

دوای ئەوەی کە خوێندنم تەواوکرد، لە لیوای کەرکووك دامەزرام بە مامۆستا لە دێیەکی سەر بە قەزای کفری لە کەرکووك هاوڕێیەکی سەردەمی قوتابخانەی خۆمم بینی، کە باسم بۆ کرد، بە جارێ سەر و دڵی گرتم و گوتی: شوێنێکی دوور و ناخۆشە. هەر ئەو ڕۆژە، دوای کەمێك بە ڕێکەوت مام جەلالم دی کە چاوی پێم کەوت، گوتی: کەریم باش نایەیتە بەرچاوم. منیش بۆم باسکرد، کەچی دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: ئینجا ئەوە چییە، بڕۆ زەرف و کاغەزێکم بۆ بێنە. کە دانیشتین گوتی: دۆستێکم لە کفری فەرمانبەری تاپۆیە و ناوی (**علي حمدي**)یە، نامەیەکی بۆ نووسیم بۆ ئەو پیاوە کە کادرێکی پێشکەوتووی پارتی بوو، بۆی نووسی کە ئاگای لێم بێ و کارئاسانیم بۆ بکات. ئێستاش دەستەواژەیەکم لەبیرماوە، نووسیبووی: "**إن كريم هذا صديق عزيز لي وهو من أبناء بلدتي وجلدتي**".

تائێستاش ئەو پەیوەندییە هاوڕێیەتییەمان هەر بەردەوامە و لە زۆر کۆڕ و کۆبوونەوە کە بەیەك دەگەین، دەبینەوە دوو هاوڕێی سەردەمی قوتابخانە و حزبایەتیی و هەر بەو شێوەیە لەگەڵ یەکتر دەدوێین.

جەنابی مام جەلال پیاوێکی بە وەفایە و هاوڕێکانی خۆی هەرگیز لەبیر ناچێ و ڕێزیان لێ دەگرێ.

لە ساڵی 1983، ڕۆژێك کاك مستەفا ساڵح کەریمی هاوڕێمم بینی. گوتی: سبەینێ لە فلان سەعات برۆ لە بەردەمی ئامادەیی پیشەسازی

بووەستە و یەکێك دێت لەگەڵی برۆ. منیش لەکاتی دیاریکراودا چووم. ئەوەندەی پێ نەچوو شەهید دڵشاد مەریوانی هات و پێکەوە ڕۆیشتین بۆ ماڵەوەیان کە چوومە ژوورەوە، کاك محەمەد موکری و شەهاب عوسمان لەوێ بوون و هاتبوونەوە ناوشار. ئەڵبەت دوای بەخێرهاتنەوە و چاك و چۆنی، شەهاب عوسمان گوتی: مام جەلال دەڵێ: من عەبدولکەریم شێخانی ناناسم، بەتایبەتیش لەو ماوەیەدا (براکوژی)یەکە دەرچوو بوو و سەرودانەم بۆ ئەو و کاك نەوشیروان ناردبوو. زۆرم لا سەیر بوو، بەڵام لە دڵی خۆمدا گوتم: من لە کاتی خوێندندا ئەو نازناوی (شێخانی)یەم بەکارنەهێناوە، بۆیە ناهەقی نییە ئەگەر ئەو نازناوە سەری لێ تێکدابێ.

لە میانی قسەکردندا کاك موکری گوتی: بەڕاستی مام جەلال زۆر ئاگای لە نووسەر و هونەرمەندانە و شوێنی حەسانەوەی بۆ سازکردوون و هەوڵ دەدات ژیانیان باش بێت.. ئینجا گوتی: باشە، بۆ نامەیەکی بۆ نانووسی. منیش بە هەلمزانی نامەیەکم بۆ نووسی، لە نامەکەدا سوپاسم کردبوو کەوا زۆر بەتەنگ برایانی نووسەر و هونەرمەندەوەیە.. ئینجا گوتبووم: بەڵام پێم سەیرە تۆ (کەریم مەحمود)ت لەبیرچوو‌بێتەوە و بڵێی نایناسم.

لە کاتی دانووستانی ساڵی 1984، برادەرێکی هەردوو لامان کە لە ئێمە بەتەمەنتر بوو، ناوی **(حسام الدين طيب)** بوو بە (شەعب) ناسرابوو، خۆی گەیاندبووە لای مام جەلال. ڕۆژێکیان لەسەر پردەکەی ناوبازاڕ تووشی بووم، گوتی: مام جەلال دەڵێ من هەرگیز قسەی وام نەکردووە و نەمگوتووە من نایناسم.

دوای ئەوە بە ماوەیەك لە کۆتەڵ چاوم پێی کەوت کە چووم بۆ لای پێشمەرگەکان ڕێیان نەدام بچم بۆ لای، منیش هاوارم کرد: مام جەلال ئەوە ناهێڵن بێم بۆ لات، ئیدی پێشمەرگەکان دەستیان شلکرد و مام جەلال ئاوڕی دایەوە و منیش چووم بۆ لای و دەستمانکردە ملی یەك و

گوتی: کەریم دەست مەکە ملم، تووشی هەلاّمەت بووم با تۆش تووش نەبیت، ئینجا گوتی: ئەو قسەیەی ئەو کوڕە کردوویەتی ڕاست نییە و من وام نەگوتووە. من چۆن وا دەڵێم تۆ برای منی.

ئەمانە چەند قۆناغێکی ژیانم بوون لەگەڵ مام جەلال وەك هاوڕێی قوتابخانە و هەڤاڵی حزبی و خوێنەریش دڵنیا دەکەم کە هیچ زێدەڕەوییەکم نەکردووە و هەر لەخۆمەوە ستایشیم نەکردووە.

**عەبدولکەریم شێخانی**

چۆن دەتوانین لایەنەکانی بیرەوەری پیاوێك کۆبکەینەوە کە بەو منداڵییە هەر لە تەمەنی 10 ساڵییەوە دەستی کردبێ بە چنینی مێژووی کۆمەلایەتی و ڕووناکبیری و سیاسی خۆی؟ چنینێك ئەوەندە ئاڵۆزی و تێکەڵاوی پەیوەندییەکانی تێدایە کە خودی چنراوەکەش سەری گلۆڵەکەی ونکردووە. ئەو نەوەی خانەوادەیەکی ئایینزادەیە، باب و باپیرانی لەو شێخانەن کە شێخایەتی تەکیەی تاڵەبانییان لە کەرکوك و کۆیە بۆ ماوەتەوە، بەلام ژیانی ئاڕاستەیەکی دیکەی وەرگرت و هەر لە منداڵییەوە ڕاستەوخۆ ڕوویکردە سیاسەت و مەیلی بەلای بیروبۆچوونی چەپڕەوانەدا چوو، بگرە ڕۆشنبیریی ئەو بیروبۆچوونەشی وەرگرت، لە خوێندنیدا، خوێندنی ئاسایی لە قوتابخانەی یەکەمی کۆیە کە تا کۆتایی بەسەرکەوتوویی بڕیویەتی لەگەڵ خوێندن لەسەر دەستی شێخەکانی تەکییەی کۆکردبووەوە و فێری بنەماکانی ئایینی ئیسلام و فیقه بوو و قورئانی پیرۆز و فەرموودە پیرۆزی پێغەمبەری لەبەرکرد و لە پاڵ زمانی کوردی دایکدا، فێری زمانی عەرەبیش بوو تا مانای هۆنراوەکانی جەواهیری تێبگات و ڕۆژنامەکانی بەغدا بخوێنێتەوە. ئەو لە ڕووی جوگرافییەوە زۆر لە پایتەختی ولاتەکەیەوە دوور بوو. دەرفەتی خۆی لە خوێندنی ئاسایی لەدەست نەدا و خوێندنی ئایینیشی لەسایەی تەکیەدا نەکردە قوربانی، بەوەش هەردوو سێوەکەی بەدەستێك گرت.

مێژوویەك چەندە هەنگاوێك بچێتە پێشەوە ئاڵۆزتر و تێکەلاوتر و سەختتر دەردەکەوێت، چنراوێکیش کە تا فراوان بێت، دەوڵەمەندتر دەبێت لە ڕووی هەمەجۆری ڕەنگ و دەوڵەمەندیی شێوە و قووڵیی فیکرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چنراوەکە هەموو دەزووەکانی گرتۆتەخۆ هەرچەندە زۆریشن، بەوەش بەرد لەدوای

بەردی خستە سەر بنیاتی سەربوردەی ژیانی، تا گەیشتە ئەم سەربوردەیە، ئەو مێژووەش چیایەکە دەچێتە ڕیزی چیاکانی کوردستانی عیراق کە پەنجەیان بۆ ڕادەکێشرێت.

ئەوە سەربوردە و بیرەوەری و مێژووی جەلال تاڵەبانی سەرۆکی عیراقە کە دەبووایە لەگەڵیدا بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی یەکەمینی، سەرچاوەی یەکەمی، وەکو بیرەوەرییەك کە دەگێڕرێتەوە و چەند شوێنێك کە سەردانیان دەکەین، لەگەڵ لە نزیکەوە ژیانێك، کە ماوەی یەك مانگی تەواو سەرۆك تاڵەبانی بۆ «الشرق الاوسط»ی ڕەخساند بەهەوڵی دکتۆر فوئاد مەعسومی کوڕی شارەکەی (کۆیسنجەق) کە کورتکراوەکەی کۆیەیە، ئەویش لە خوێندنی سەرەتاییەوە تا ئەمڕۆ لەگەڵیدا بووە لە هەموو قۆناغەکانیدا.

*بیرۆکەکە لە بەهاری ڕابردوودا (2008) سەریهەڵدا، کاتێك ڕاستەوخۆ لەگەڵ دکتۆر فوئاد مەعسوم لە سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و سەرۆکی کوتلەی کوردستانی لە ئەنجومەنی نوێنەران (پەرلەمان)ی عیراق و کەسی زۆر نزیك لە سەرۆك تاڵەبانی، قسەمان کرد، بیرۆکەکە ئەوەبووە بەشێك لە مێژوو یاخود بیرەوەرییەکانی سەرۆك بنووسینەوە تا بەچەند ئەڵقەیەك لە لاپەڕەکانی «الشرق الاوسط» بلاوی بکەینەوە. ئەو پیاوە پێشوازیی لە بیرۆکەکە کرد و بە پەرۆش بوو بۆی، بەلام ئەوە بەس نەبوو بۆ جێبەجێکردنی ئەم جۆرە پرۆژەیە، ئەویش لەبەرئەوەی «سەرۆك بە بەردەوامی سەرقاڵە، چونکە جگە لە بەرپرسیارێتییەکانی وەك سەرۆك کۆمار، سکرتێری یەکێکە لە گەورەترین حزبە سیاسییە کوردی و عیراقییەکان کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە» لە پاڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا کە یەکەم حزبی کوردییە لە عیراق کە سەرکردەی کورد مەلا مستەفا

بارزانی دایمەزراند و ئەمڕۆش مەسعود بـــارزانی کوڕی ڕێبەرایەتیی دەکات.

مەعسوم پرسیاری کرد و وتی: «چۆن بیرۆکەکە جێبەجێ دەکەن، ئایا پرسیارەکانی بە نووسراوی ئاڕاستە دەکەن و لە کاتی دەستبەتاڵیدا وەڵامیان دەداتەوە، یاخود بە دیداری ڕاستەوخۆ؟» وەڵاممان دایەوە کە گونجاوترین شێواز دیداری ڕاستەوخۆ و لەگەڵ ژیانی نزیك لە ژیانی ڕۆژانەیەتی. لێرەشدا مەسەلەکە ئاڵۆزتر و سەختتر دەرکەوت، وتی: «ئەو کارە کاتێکی دوورودرێژ دەبات و پێویستە هاوەڵی بن لە نێوان بەغدا و سلێمانیدا».

لە نێوان بەغدا و لەندەن و سلێمانی و کۆیە و دوکاندا پەیوەندی تەلەفۆنی و نامەناردن لەڕێی پۆستی ئەلیکترۆنییەوە لەگەڵ دکتۆر مەعسومدا بەڕێوەدەچوون، یەکەم هەواڵی خۆشیش ئەوەبوو کە سەرۆك تاڵەبانی ڕەزامەندی لەسەر بیرۆکەکە دەربڕیووە و ئەوەشی دەستنیشانکردووە کە دەبێت بە تەنیا بۆ «الشرق الاوسط» بێت و ئێمەش ئەو دیدارانە ئەنجامبدەین و سەبرێکی دوورودرێژ بگرین بۆ چاودێریکردنی بەمەبەستی ئەنجامدانی گفتوگۆکان.

لە بەهاری ئەمساڵیشدا ڕەزامەندیمان وەرگرت بۆ ئەوەی دەستبکەین بە جێبەجێکردن بەمەرجێك هاوئاهەنگی لەگەڵ نووسینگەی سکرتاریەتی سەرۆك بکرێت، کە هاوکارییەکی زۆریان نیشاندا بۆ دانانی خشتەیەکی زەمەنی بۆ ئەنجامدانی دیدار و گفتوگۆکان. کاتێکیش گەیشتینە بەغدا بەهاری گەردەلوولە خۆڵاوییەکان لە پێشوازیماندا بوو، ئەو گەردەلوولانەی کە دەیانتوانی جووڵەی ژیان پەکبخەن و پێش هەمووشیان جووڵەی فڕۆکەوانی، بەڵام ئەو عیراقییانەی بەرەنگاری سەختی زۆر بوونەوە، سەختی جەنگ و بۆردومانی ئاسمانی و وشکانی و

دەریایی و زنجیرەی بۆمبڕێژکراوەکان و بۆمبە موگناتیسییەکان و تاوانەکانی ڕفاندن و کوشتنی هەڕەمەکی بوونەوە، بینیمانن پایتەختی عیراقیان پڕکردووە لە جووڵە و جەنجاڵی تەنانەت کاتێك خۆڵی سووری نەرمیشیان هەڵدەمژی وەك ئەوەی پێشبڕکێی زەمەن بکەن بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو دەرفەتانەی لە کیسیان دەچێت، تەنانەت ئەم ڕەوشە لە جموجوڵـــــی سیاسەتمەدارەکانیشدا هەبوو.

ڕێگای نێوان فرۆکەخانەی نێودەوڵەتیی بەغدا و میوانخانەی سەر بە نووسینگەی سەرۆك کۆمار دوورودرێژ نەبوو کە تەنیا چەند مەترێکی کەم لە شوێنی نیشتەجێبوونی خودی سەرۆك تاڵەبانییەوە دووربوو، بە کۆشکی سەلامدا تێپەڕین بە گومەز و منارە زێڕینەکانییەوە کە لە وەسفکردنی بەغدا لە هەزار و یەك شەوە وەرگیراوە، هاوەڵەکەم ڕوونیکردەوە کە ئەم کۆشکە یەکێك بووە لە کۆشکەکانی سەدام حسێن و ناوی کۆشکی سندیبادی لێنراوە، بەلام سەرۆك تاڵەبانی فەرمانیدا بە بنیاتنانەوەی و دانانی بە کۆشکێکی سەرۆکایەتی بۆ ئەوەی تێیدا پێشوازی لە گەورە میوانانی عیراق بکرێت، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەر ڕووباری دیجلە و زۆر لە نووسینگە و شوێنی نیشتەجێبوونی خودی سەرۆکیشەوە دوور نییە. لە خاڵەکانی پشکنین بە ئاسانییەکی زۆر تێپەڕین، چونکە ئەوەی زانراوە لە بەغدا نووسینگەی سەرۆك و سکرتاریەتەکەی لە پلەیەکی بەرز و وردی هاوئاهەنگیدان و بواری دروستبوونی کەلێن یاخود هەڵە نییە، ئەمەش لە خودی کەسایەتی سەرۆك تاڵەبانییەوە وەرگیراوە، چونکە درکم بەوەکرد کە ئاستی وردی و بەدواداچوونی بۆ وردەکاریی کاروبارەکان چەندە، بۆیە هەموو شتێك لە ئەلفەوە تا یا ئامادەکرابوو، ناوی سەردانیکەر و مەبەستی سەردانەکەی لەلای خاڵەکانی پشکنین و

ئەفسەرانی پاسەوانی هەبوون، هەمووشیان لە جەنگاوەرانی پێشمەرگەی دێرین یاخود تازەن و بە زەردەخەنە و وشەی بەخێرهێنانی عەرەبی و کوردی ڕوو دەکەنە میوانان «اهلا وسهلا»، «سەرچاو»، کە ئەمەش وشەیەکی کوردییە حەزم پێکرد و مانای «بەچاوان»ە.

لە میوانخانەکە دوو کچە ڕۆژنامەنووسی فنلەندیم ناسی کە بۆ یەکێك لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی فنلەندا کار دەکەن، موحەریرێك و وێنەگرێك بوون، لە ڕێی ڤیەنناوە گەیشتبوونە فڕۆکەخانەی هەولێر و پاشان چووبوونە سلێمانی بۆ دیداری سەرۆك و لە سلێمانیشەوە بۆ بەغدا و دەبێت بۆ ڕۆژی دواتریش هاوەڵی سەرۆك تاڵەبانی بکەن بۆ سلێمانی، هەموو ئەمەش لەپێناوی دیدارێکی تەلەفزیۆنیدا کە ماوەکەی لە چل دەقیقە تێناپەڕێت و دوای چاوەڕوانییەکی زۆر کە زیـــاتر لە سێ هەفتەی خایاندبوو، بەدەستهات.

ئانای موحەریر سەرۆکی دەناسی، چونکە بۆ یەکەمجار لە ساڵی 1991 لە چیای ماوەت بینیبووی کاتێك بینایەکی کردبووە نووسینگەی خۆی کە بۆردومانی تۆپەکانی هێزەکانی حکومەت لەو کاتەدا خاپووری کردبوو. ئانا وتی: «نووسینگەیەك بوو بە بێ سەقف و پەنجەرە و دەرگا، ئەوکاتە هێرۆخانی هاوسەری لەگەڵدا بوو، سەرماوسۆڵەیەکی سەخت بوو هەرچەندە داریان لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دەسووتاند»، تەنانەت کاتێك دواتر ئانا پرسیاری لە سەرۆك تاڵەبانی کرد سەبارەت بە جیاوازیی نێوان نووسینگەکەی لە چیای ماوەت و لە بەغدا، ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە «ئەم نووسینگەیە سەقف و پەنجەرە و دەرگای تێدایە و ئەویان ڕووت بوو». زیاتریش وتی: «من بەلامەوە گرنگ نییە نووسینگە چی تێدایە؟ گرنگ شوێنێکە بتوانم لە ڕێیەوە کاروبارەکانی دەوڵەت

یاخود حزب بەڕێوەبەرم، چونکە ساڵانێکی دوورودرێژمان لە چیاکان لە نێو ئەشکەوت و خانووی قوڕدا بەسەر برد کە سەرکردایەتیی حزبەکەمان و شۆڕشی کوردمان دەکرد تا سەرکەوتنمان بەدەستهێنا».

یەکێك لە ئەندامانی سکرتاریەت پێی ڕاگەیاندم سەرۆك ئاگادارە کە لەوێم و پێشنیاری کرد ئەمشەو پشوو بدەم و «سبەینێ نیوەڕۆ چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکەیت و پاشنیوەڕۆ لەگەڵمان دێیت بۆ سلێمانی». نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر لە کاتێکدا بیرم لە کات و ئەو شێوازە دەکردەوە کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرۆك تاڵەبانی پێ بکەم، یەکێك لە هاوەڵانی هات و داوای لێکردم لەگەڵی بچم بۆ نووسینگەی سەرۆك کە تەنیا دوو دەقیقە لە میوانخانەکەوە دووربوو، لە کاتێکدا چای بەغدادیمان دەخواردەوە، سەرۆك بە هێمنی هاتە ژوورەوە بە زەردەخەنە بەردەوامەکەیەوە و سڵاوی لێکردم و وتی: «بەخێربێیت برا و دۆستم». چوست و چالاك بوو، چونکە لە سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژەوە زۆرێك لە کاروبارەکانی سەرۆکایەتی ڕاپەڕاندبوو، هەروەك لێدوانێکیشی بە زمانی ئینگلیزی دابوو بە کەناڵێکی تەلەفزیۆنی بەریتانیا. دەربارەی «الشرق الاوسط» و کارمەندەکانی پرسیاری لێکردم و ئەوەشی پیشاندا کە بەدواداچوونی تەواوی هەیە بۆ ئەو بابەتانەی ڕۆژنامەکە بڵاویان دەکاتەوە، پاشان بە هەستە ڕۆژنامەنووسانە بەرزەکەی نەخشەی کارکردنمانی بۆ کورتکردمەوە و وتی: «تۆ هاوەڵیم دەکەیت و لێمەوە نزیك دەبیت، گرنگ تەنیا ئەوە نییە کە لە گفتوگۆ ڕاستەوخۆکانی نێوانماندا دەیڵێم، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئاگاداری شێوازی کارکردن و ژیانم بیت وەکو خۆی و دواتریش تۆ ئازادیت لەوەی دەینووسیت و بۆ خوێنەری دەگوازیتەوە، بۆیە ئەوە بەرپرسیارێتی تۆیە و دەبێت بە ئازادی پەیڕەوی بکەیت بە چاوپۆشین لە ڕازی بوونمان یان نەبوونمان».

سەرۆك تاڵەبانی وەك هاوكارێك لەم پیشە سەختەدا قسەی بۆ دەكردم، چونكە لەمیانی گفتوگۆكانی لەگەڵەماندا دانی بەوەدانا كە لە ڕۆژنامەگەرییەوە نزیكترە تا لە سیاسەت و لەنێوان ساڵانی 1959 و 1960دا سەرنووسەری ڕۆژنامەی «كوردستان» بووە كە بە زمانی كوردی لە بەغدا دەردەچوو، هەروەك بە بەردەوامی لە ڕۆژنامەی «خەبات»دا دەینووسی و یەكێكە لە ڕۆژنامەنووسە پێشڕەوەكانی عیراق، چونكە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی یەكەم سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی عیراق بووە كە محەمەد مەهدی جەواهیری شاعیر سەرۆكایەتی دەكرد، بەگوێرەی قسەكانی «ئاواتم ئەوەبوو كە ڕۆژنامەیەك لە سایەی عیراقێكی دیموكراتدا دەربكەم، ئەمە گرنگترین ئاواتم بوو» لەبەرئەوە لەلایەن ژمارەیەك ڕۆژنامەنووسی دێرینی عیراقەوە لەنێویاندا فائق بەتی و فەخری كەریم، بەبۆنەی جەژنی ڕۆژنامەگەریی عیراقەوە دیاری «الرقیم الذهبي» پێبەخشرا بەوپێیەی یەكێكە لە دیارترین پێشەوایانی. ئەو ڕۆژە دكتۆر ئەیاد عەلاوی لەسەر نیوەڕۆخوانەكە بوو كە بە سەرۆكایەتی وەفدێكی لیستی ئەلعیراقیە سەردانی كردبوو جەختیشی لەسەر ئەوە كردەوە كە بە سەرۆكی عیراق بمێنێتەوە و خۆی بۆ ماوەیەكی دیكەی سەرۆكایەتی بپاڵێوێت بەوپێیەی كە كەسێكی گونجاوە بۆ ئەو شوێنە.

سەرۆك ماوەیەك بەر لەم دیدارە ڕایگەیاندبوو كە بیر لە خانەنشینبوون لە پۆستی سەرۆك كۆمار و خۆتەرخانكردن بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەكانی دەكاتەوە، بەڵام چەندین گرووپی سیاسی داوایان لێكرد كە پاشگەزبێتەوە لەو بڕیارەی كە لەو بارەیەشەوە بە «الشرق الاوسط»ی وت: «لەكاتی خۆیدا بیر لەم مەسەلەیە دەكەمەوە».

پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە گەردەلوولە خۆڵاوییەکە بەهێزتر بوو کە ئەوەش هەڕەشەی هەڵوەشاندنەوەی گەشتەکەمانی دەکرد بۆ شاری سلێمانی، لەبەرئەوەی کەس پێیڕانەگەیاندبووین کە گەشتەکەمان هەڵدەوەشێتەوە، ئەوا ئامادەبووین لە چاوەڕوانی دەرچوونمان بەرەو فڕۆکەخانە، بەتایبەتی کە جانتاکانمان پێش خۆمان بەرەو فڕۆکەکە ڕۆیشتبوون، لەکاتێکدا سەرۆك تاڵەبانی بەردەوام بوو لە دیدارەکانی لەگەڵ هەندێك لە بەرپرسان و سەرکردەی هەندێك حزب و ڕەوتی سیاسی لەنێویاندا تارق ئەلهاشمی جێگری سەرۆك.

پاش سەعات پێنجی ئێوارە پێمان ڕاگەیەندرا کە کاروانەکەی سەرۆك بەرەو فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی بەغدا دەکەوێتەڕێ، پێش ئەوە و لە کاتێکیی زووەوە ناوی ئەوانە دیاریکرا کە لەگەڵی دەڕۆن و ژمارەی ئەو ئۆتۆمبێلانەش کە هەر کۆمەڵـێك دەگوازنەوە، بگرە ڕیزبەندیی ئۆتۆمبێلەکەش لە کاروانەکەدا دەستنیشان کرا.

کاروانەکەی سەرۆك کۆمار وەك ئەوە نەبوو کە پێشبینیم کرد، چونکە کاروانی زۆر لە بەرپرسانی خوار پۆستەکەی ئەو ژمارەیەکی زۆر پاسەوان و ئۆتۆمبێلی زرێپۆشیان لەخۆدەگرت، لەکاتێکدا کاروانەکەی سەرۆك تاڵەبانی یەك ئۆتۆمبێلی زرێپۆشی لەپێشەوە تێدابوو، دوا بەدوای ئەویش ئۆتۆمبێلی دەبڵ ئەکسل بۆ ڕێکخستنی کاروانەکە و پاشانیش ئۆتۆمبێلەکەی سەرۆك، ئۆتۆمبێلی هاوەڵەکانیشی لە میوان و ئەندامانی نووسینگەی سکرتاریەت و یاوەرە تایبەتییەکانی خۆی. پاسەوانەکانی تەنیا لە پێشمەرگەبوون و هیچ یەکێك لە هێزەکانی ئەمریکا یاخود هەر هێزێکی بیانی دیکەیان تێدانەبوو، ئەوەش کە سەرنجی ڕاکێشاین ئەوەبوو کە ڕۆیشتنی کاروانەکەی سەرۆك کۆمار بەنێو شەقامەکانی بەغدادا بەرەو فڕۆکەخانە پێویستی بەداخستنی

هاتوچۆ یان شڵەژانی جموجوڵی ئاسمانی لە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی بەغدا نەبوو.

فڕۆکەیەکی سەرۆکایەتی یاخود فڕۆکەیەکی تایبەت بە سەرۆك کۆمار لەوێ نەبوو، بەڵکو فڕۆکەیەکی ئاسایی لێبوو لە فڕۆکەکانی هێڵی ئاسمانی عیراق، فڕۆکەیەکی بچووك بوو هەمان فڕۆکەی کە گەشتی ئاسایی بۆ هەولێر و بەسرە و سلێمانی دەکات، کاستەکەشی لە فەرمانبەرانی هێڵی ئاسمانی عیراق بوون، تەنانەت لە ناوەوەشیدا هیچ ئیمتیازێکی ئەوتۆی تێدانەبوو کە شایانی باسکردن بێت و فڕۆکەیەك بێت لە جۆرێکی تر، هەندێك لە ئەندامانی کاستەکە داوایان کرد هەندێك وێنەی یادەوەری لەگەڵ سەرۆك تاڵەبانی بگرن ئەویش پێشوازی لەو بیرۆکەیە کرد و دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵیان و لەبارەی بارودۆخیان و هەلومەرجی کارکردنیان پرسیاری لێکردن، پاشان کتێبێکی دەرهێنا کە لەماوەی ئەو پەنجا دەقیقەیەدا دەیخوێندەوە کە ماوەی گەشتەکە بوو لە بەغداوە بۆ سلێمانی.

تەنانەت لە سلێمانیش کە بە بارەگای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دادەنرێت و سەرۆکی عیراق تێیدا نیشتەجێیە، ئەوا کاروانەکەی تاڵەبانی هاتوچۆی لە شەقامەکاندا ڕانەگرت، بەڵکو بە شەویش ژیانی تێدا بەردەوامبوو.

ماڵی سەرۆك تاڵەبانی، کە لێرەدا دەبوایە لەسەر نازناوی سەرۆك بە کوردی «مام جەلال» ڕابێین کە واتای «مامە جەلال»ە نەك سەرۆك تاڵەبانی، دەکەوێتە سەر چیایەك و بەسەر بەشێکی گەورەی شارەکەدا دەڕوانێت، ماڵەکە کاری هونەری شێوەکاریی تێدا دانراوە لە تابلۆ و داتاشراو، هێرۆخان هاوسەری سەرۆك وتی: ئەو کارانە زۆر بەوردی هەڵدەبژێرێت، هەڵبژاردنێك کە نیشانەی

هۆشیاری و ئاگاداربوون و تێگەیشتنێکی وردە لە بابەتی کارەکە و بونیاد و ڕەنگەکانی کە لەگەڵ هەموو شتێکی ناوماڵەکەدا ڕێکدەکەوێت کە ئەوانیش گوزارشتن لە چێژێکی بەرز کە سادەیی و جوانی کۆکردۆتەوە.

بەگیانی سادە و زەردەخەنە و قسەکانیەوە کە ئاماژەبوون بۆ متمانە بوونێکی بەرز بە کەسایەتییەکەی و سەرەڕای سادەییەکەشی کە ماوەی نێوان خۆی و کەسانی دیکە دەسڕێتەوە، هێرۆخانی خاوەن ماڵ بەخێرهاتنی کردین، لێمپرسی کە ئایا مانەوەی لە سلێمانی یاخود بەغدا پێ باشترە، وتی: «من بەغدام پێ خۆشە، چونکە بەشێك لە ژیانم تێدا بەسەربردووە و لە یەکێك لە زانکۆکانیدا «موستەنسرییە» خوێندوومە، بەڵام مانەوەم لە سلێمانیدا پێ باشترە بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ڕێکخراوەکەم بکەم کە بایەخ بە منداڵان دەدات، بەگشتی من لەوەتەی شوومکردووە تا ئەمڕۆ سەقامگیربوون نازانم، ساڵانێك لە شاخ، پاشان لەنێوان دیمەشق و سلێمانی و ئێستاش لە نێوان سلێمانی و بەغدا و ئیتر ئاوا...».

وتم: «ماڵەکەت جوان دیارە»، سەرۆك تاڵەبانی زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: «ئەمە ماڵی ئێمە نییە، ئەم ماڵە لە فەرمانگەی خانووبەرە بەناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە تۆمارکراوە و ئەگەر بچیتە فەرمانگەکانی تۆماری خانووبەرە چ لە سلێمانی یاخود لە بەغدا یان هەر شارێکی دیکەی عیراق خانووبەرەیەك یان یەك پارچە زەوی نابینیت بەناوی منەوە یاخود بەناوی هاوسەرەکەمەوە تۆمار کرابێت، ئێمە خاوەنی یەك شوقەین لە دیمەشق کە لە ساڵی 1975دا کڕیومانە، هەرچی دەرماڵەکەشمە وەك سەرۆك کۆمار ئەوا بۆ یارمەتیدانی ڕووناکبیر و سیاسەتمەدار

و عیراقییە کەمدەرامەتەکان تەرخانکراوە و خۆشت دەتوانیت سەیری بکەیت ئەوکاتە دەبینیت چۆن دابەشکراوە». زیاتریش وتی: «زۆرجار هاوسەرەکەم پێمدەڵێت ئەگەر ئێمە بمرین شارەوانی بەخاکماندەسپێرێت، چونکە دەمرین و هیچ پارەیەکمان پێنابێت، بۆیە پێموت ئەوکاتە گەلەکەمان ڕێزمان لێدەنێت».

لەسەر ئێوارە خوانەکە قەلی برژاو و هەندێك برنج و شلەی باینجان و کەبابی بەناوبانگی سلێمانی لێبوو، سەرۆك تاڵەبانی وتی: «گوێ لەم نوکتەیە بگرن، کاتێك نەخۆشکەوتم عیراقییەکان وتیان سەرۆك قەلی نەهێشت، چونکە بۆ تەندروستییەکەی گونجاوە، کاتێکیش لە نەخۆشییەکەی چاکبووەوە مەڕی نەهێشت، چونکە خەڵك وەك قوربانی بۆ خوا و سوپاسگوزاریی سەلامەتی ئەو سەریان دەبڕین». دوای ئەوە پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا کەسمان نوکتەیەکی تازەی لەبارەی تاڵەبانییەوە بیستووە، وتم ڕێگەمبدەن ئەم نوکتەیە بگێڕمەوە، ئەویش وتی: «تکایە فەرموو، چونکە من هەموو ئەو نوکتانە کۆدەکەمەوە کە لەبارەی تاڵەبانییەوە دەوترێن» بۆیە نوکتەیەکم بۆ گێڕایەوە کە ڕۆژێك پێشتر لە بەغدا بیستبووم، پێکەنی وتی: «ئەمە تازەیە سوپاس» ئەوەش لەبەرئەوەیە کە سەرۆك تاڵەبانی نوکتە لەسەر خۆی دەگێڕێتەوە، بەڵام هەمیشە دەڵێت: گوێ لەم نوکتەیە بگرن لەسەر جەلال تاڵەبانی، واتا وا دەیگێڕێتەوە وەك ئەوەی لەسەر کەسێکی تر وترابێت، پاشان زیاتر وتی: «پرۆژەیەکم هەیە بۆ دەرکردنی کتێبێك کە هەموو ئەو نوکتانەی تێدا کۆدەکەمەوە کە لەبارەی تاڵەبانییەوە وتراون».

لەم زنجیرە گفتوگۆ ڕاستەوخۆیانەماندا لە سەرۆکم پرسی: «حەزدەکەن خەڵك بەچی بانگتان بکات؟» لە وەڵامدا دەستبەجێ و

بەبێ هیچ پێشەکییەك وتی: «بێگومان بە مام جەلال»، پاشان زیاتر وتی: «من ئەم نازنـــاوەم خۆشدەوێت کە بەدرێژایی ژیانم پێی ناسراوم».

دوای مانگێك کە ڕۆژانە لەگەڵ سەرۆکی عیراق ژیاوم گەیشتمە ئەنجامێکی گرنگ، ئەویش ئەوەیە کە ئەم پیاوەی مێژووەکەی پڕە لە دەستکەوتی سیاسی و ژیانیی، ئەگەر دابەشیان بکەین بەسەر ژمارەی ساڵانی تەمەنیدا ئەوا زیاتر دەبن، جگە لە «مام جەلال» کەسی دیکە نییە، چ خەباتگێڕێکی سیاسی بێت یاخود جەنگاوەرێك لە شاخ یان سەرکردەی حزبێکی سیاسی یاخود سەرۆکی کۆماری عیراق، پێشوازی لە میوانەکانی دەکات و قسە لەگەڵ خەڵك دەکات و کارەکانی زۆر بەلەخۆبردوویی و سادەییەوە ئەنجام دەدات، ڕاوێژکار و یاریدەدەر و نووسینگەی سکرتاریەتی لە چواردەورە لێبڕاوانە کار بۆ خزمەتکردنی دەکەن، بەناوی خۆیان دەیانناسێت، چونکە زۆربەی ئەندامانی نووسینگەی سکرتاریەتەکەی لە ڕۆڵەی شەهیدانی شۆڕشی کورد و هەڤاڵانی خەباتی چەکدارییین، یاخود لەوانەی کە لە شاخ لەگەڵیدا خەباتیان کردووە، وەکو برا یان باوك قسەیان لەگەڵ دەکات، لەگەڵ کەسانی دیکەشدا هەروایە، چونکە لە ڕێگادا لە دوکانەوە بەرەو قەرەداغ لەنێو بەرزاییە شاخاویەکاندا بەڕێوەبووین بۆ ئامادەبوون لە فیستیڤاڵی ڕووناکبیری ساڵانەی عەشیرەتی جافدا، «مام جەلال» بەمەبەست وایکرد کە کاروانەکەی زۆر بچوك بێت، لەکاتی گەیشتنیشماندا بۆ پێش شوێنی فیستیڤاڵەکە کە قەرەباڵغییەکە گەیشتبووە ئەوپەڕی و بەسەدان ئۆتۆمبێل هەوڵیاندەدا بگەنە شوێنەکە، ئەندامانی پاسەوانیی سەرۆك هەوڵیان نەدا ڕێگاکە لەبەردەم کاروانەکەی سەرۆکدا بکەنەوە، هەروەك بە ڕێنمایی

توندی خۆی نەهاتنە پێشەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی لێ دووربخەنەوە کە کاروانەکە درەنگ کەوت بەهۆی کرانەوەی ڕێگاکە لەبەردەم ئۆتۆمبێلەکانی دیکەدا و ئەندامانی پۆلیسی ناوخۆ هاتوچۆیان ڕێکدەخست، بەدرێژایی ماوەی چاوەڕوانیش «مام جەلال» پەنجەرەی ئۆتۆمبێلەکەی کردبووەوە و لەگەڵ خەڵکەکە و هاووڵاتییانی قسەی دەکرد، گوێی لێدەگرتن و پێدەکەنی و پرسیاری لێدەکردن و بە هەواڵە باشەکان دڵخۆش دەبوو، لەژێر ئەو کەپرەشدا کە لێی دانیشتبوو پێشوازیی لە ژمارەیەکی زۆر لەو هاووڵاتییانە کرد کە بۆ سڵاولێکردن و گرتنی وێنەی یادەوەری هاتبوون.

نوقمی بیرکردنەوە دەبووم کاتێك سەرۆك تاڵەبانی قسەی بۆ دەکردم سەبارەت بە سەدام حسێنی سەرۆکی پێشووی عیراق و چۆن ئەو «سەدام حسێن» لێبوردنی بۆ تاڵەبانی دەرنەکردووە و کاتێك لەگەڵیدا دادەنیشت بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ کێشەی کورد، دەکەوتمە بیر کردنەوەوە، پرسیاری ئەوەم دەکرد: «ئایا ئەوکاتە تاڵەبانی بیری لەوە دەکردەوە یان پێشبینی دەکرد ببێتە سەرۆك کۆماری عیراق؟» مام جەلال وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: «لە نەخشەی ژیانمدا لە هیچ وێستگەیەکیدا شتێکم دانەنابوو ناوی سەرۆکایەتی کۆماربێت، لە سەرەتای ژیانیشمدا خواستم ئەوەبوو ببمە مامۆستا لە زانکۆ، کاتێکیش تێکەڵ بە کاری سیاسی بووم کارم بۆ سیستمێکی دیموکرات و دەرکردنی ڕۆژنامەیەك دەکرد، پلانم بۆ گرتنە ئەستۆی ئەم جۆرە بەرپرسیارێتیانە دانەدەنا، تەنانەت لەو دانوستاندانەشدا کە لەگەڵ حکومەتەکانی عیراقدا بەڕێوەچوون، خۆم بۆ هیچ پۆستێك نەپاڵاوت، جارێکیشیان داوای ئەوەیان لێکردم و ڕازی نەبووم.

ئاواتم ئەوەبوو ببمە سەرنووسەری ڕۆژنامەیەك وەكو چۆن لە بەغدا لە ساڵانی 1959 و 1960دا سەرنووسەری ڕۆژنامەی «كوردستان» بووم بەزمانی كوردی و ئەندامی ڕۆژنامەی «خەبات» بووم، چونكە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی عیراق بووم لە ساڵی 1959دا كە نەقیبەكەی شاعیری گەورە محەمەد مەهدی جەواهیری بوو، ئەوپەڕی ئەندامێك بوومایە لە پەرلەمانی عیراقدا ئەگەر هەلومەرج ڕەخسا، بەڵام پێم وابوو كە لە سایەی عیراقێكی دیموكراتدا دەكرێت سەرۆك كەسێكی كورد بێت، بەڵام جەلال تاڵەبانی نا، لە مێژووی دەوڵەتی عیراقیشدا ڕوویداوە كە پۆستی گرنگ بدرێت بە كورد وەك عەلی ساڵح سەعدی كە كوردێكە لە هەولێر و تاهیر یەحیا كە كوردە و بووە سەرۆك وەزیرانی عیراق».

کەواتە چۆن تاڵەبانی ڕێگای بەرەو سەرۆکایەتی دۆزیەوە؟ کێ کاندیدی کرد بۆ ئەم پۆستە کە بەهیچ شێوەیەك بیری لێنەکردبووەوە؟ سەرۆك دەڵێت: «سەرکردایەتیی کورد پێشنیاریکرد کە مەسعود بارزانی بۆ سەرۆکایەتی هەرێم کاندید بکرێت و منیش بۆ سەرۆکایەتی عیراق کاندید بکرێم، لە مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا دوو ڕا هەبوو، یەکەم پێی وابوو مانەوەم لە سلێمانی و سەرکردایەتیکردنی حزب و سەرپەرشتیکردنی بارودۆخ و حکومەتی ناوخۆ، باشترە لە چوونم بۆ بەغدا، ڕای دووەمیش پێی وابوو کە بوونم لە بەغدا وەك سەرۆك کۆمار باشترە بۆ عیراق و بۆ ئێمەش، من وەك خۆم لەگەڵ ڕای یەکەم بووم و نەمدەویست بچم بۆ بەغدا، دوای گفتوگۆیەکی دووروودرێژ، ڕای زۆرینەمان وەرگرت کە لەگەڵ ئەوەدا بوو بچم بۆ بەغدا و خۆم بۆ سەرۆکایەتی کۆمار کاندید بکەم».

بەڵام مام جەلال لە حزبەکەیدا بەبێ مەرج ملکەچی ڕای زۆرینە نەبوو، دەڵێت: «دوو مەرجم دانا، یەکەم وتم: ئەگەر چووم بۆ بەغدا ئەوا جلوبەرگی کوردی دادەکەنم و عەبای عیراقی دەپۆشم، چونکە کەسێتی عیراقی بەرجەستە دەکەم و سەرۆکی عیراق دەبم نەك سەرۆکی کورد، مەرجی دووەمیش ئەوەبوو کاندیدکردنەکەم لەلایەن هێزە سیاسییە سەرەکییەکانەوە لە عیراق قبوڵکراوبێت و ئەم قبوڵکردن و پشتیوانییەشمان بەدەستهێنا کە ئیئتیلافی عیراقی ڕازیبوو، هەروەها لیستی ئەلعیراقیە بە سەرۆکایەتیی دکتۆر ئەیاد عەلاوی و بەشێکی زۆر لە بەرەی تەوافوقیش پشتیوانبوون ئەمە جگە لە هاوپەیمانیی کوردستان، پاشان ئەم پێکهاتەیەی سەرۆکایەتی کە

پێكدێت لە سەرۆك و هەردوو جێگرەكەی سەرۆك، لە پەرلەمان زیاتر لە دوو لەسەر سێی دەنگەكانمان بەدەستهێنا و سوێندمان بە قورئانی پیرۆز خوارد كە پارێزگاری لە دەستوور و یەكێتی و سەقامگیری عیراق بكەین».

مام جەلال لە سلێمانی ئەزموونی سەرۆكایەتی پەیڕەو كردووە، سەرۆكایەتیی هەرێم لەوێوە، هەرچەندە ئەزموونێكی سنووورداربوو و فراوان نەبوو وەك سەرۆكایەتیی هەموو عیراق، ئەوەش ڕووندەكاتەوە و دەڵێت: «لە كوردستان كاتێك دوو حكومەت هەبوو، یەكێك لە هەولێر و ئەوی دیكەش لە سلێمانی، من سەرۆكی هەرێم بووم لە سلێمانی، كاتێكیش لە هەولێر بووین هیچ پۆستێكم وەرنەگرت، بەڵكو سكرتێری گشتی یەكێتی بووم، ماوەیەكیش دكتۆر فوئاد مەعسوم سەرۆكی حكومەت بوو، پاشان كۆسرەت ڕەسوڵ، لەكاتێكدا من سكرتێری گشتی حزبەكە بووم، لەسەر شێوازی سۆڤێتیی كۆن».

ڕێگای مام جەلال بۆ سەرۆكایەتیی كۆمار ڕووبەڕووی نارەزایی بووەوە، كەسانێك هەبوون نارازیبوون بە ڕۆیشتنی بۆ بەغدا كە یەكەمیان هیرۆخانی هاوسەری بوو، دانبەوەشدا دەنێت و دەڵێت: «لە كوردستان زۆر كەس نارازیبوون بەڕۆیشتنم بۆ بەغدا لە هاوسەرەكەمەوە تا دەگاتە هەندێك سەركردەی یەكێتیی نیشتمانیی، لە بەغداش بە ئاشكرا تێبینی هیچ بەرهەڵستییەكم نەكرد سەبارەت بە كاندیدكردنم، بەڵام نازانم هەڵوێستی ڕەوتی سەدر چیبوو، ئایا دەنگیان لەگەڵماندا یان لە دژمان، ئەگەرچی بە ئاشكرا ئەوان ڕووخۆشن لەگەڵمان، هەروەها هەندێك لە نەتەوەپەرستەكان لە بەرەی تەوافوق كە نازانم چەند كەسیان دەنگیان بۆ داین، هەرچی ئیدارەی ئەمریكاشە ئەوا پشتیوانی

کاندیدکردنمی کرد بۆ سەرۆکایەتی، چونکە پێیانوابوو باشترین کەسم بۆ ئەو پۆستە، بەڵام لە سایەی حوکمی بریمەردا (پۆل بریمەر حاکمی مەدەنی ئەمریکا لە عیراق لەدوای 2003) ئەوا بەرهەڵستییەك هەبوو بۆ ئەوەی کوردێك سەرکردایەتی وەربگرێت، بریمەر پێیوابوو کە دەبێت سەرۆکی حکومەت یاخود کۆمار کورد نەبن، بەڵام زاڵمای خەلیلزاد باڵیۆزی ئەمریکا هەڵوێستی بەپێچەوانەی هەڵوێستی بریمەرەوە بوو. تەنانەت لە ئەنجومەنی حوکمیشدا کە من ئەندامبووم تێیدا، بریمەر بەرهەڵستی ئەوەیکرد کە ببمە سەرۆکی کۆمار، بۆیە غازی یاوەرمان کاندید کرد. ئێمە چاومان نەبڕیوەتە هیچ پۆستێك، بەڵام بەرهەڵستی ئەو بنەمایەمان دەکرد و دەمانوت مافی هەر عیراقییەکە بچێتە هەر پۆستێك، بەمەرجێك مەرجەکانی تێدابێت».

سەرۆك تاڵەبانی ڕێچکەی بریمەر لە حوکمکردنی عیراقدا ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: «لە سەرەتای بوونی ئەمریکادا جەی گارنەر و خەلیلزادیشی لەگەڵدابوو کە باڵیۆزی ئەمریکا بوو لەلای ئۆپۆزسیۆنی عیراق و ڕای ئەو و ڕای گارنەر ئەوەبوو کە دوای ڕووخانی ڕژێمی پێشوو ڕاستەوخۆ حکومەتێکی نیشتمانی عیراقی کاتی پێکبهێنرێت و منیان کاندیدکرد بۆ سەرۆکایەتی ئەو حکومەتە، گارنەر و خەلیلزاد هاتن بۆ ئێرە لە دوکان ئەوەیان خستەڕوو بۆ من و برام مەسعود بارزانی کە بچینە بەغدا بۆ پێکهێنانی حکومەت، بەکردەوەش چووین بۆ بەغدا کە ئەوکاتە ئارام بوو، بارزانی لە ئوتێلێك نیشتەجێبوو لەکاتێکدا ئێمە ماڵێکمان لە گەڕەکی مەنسور بەکرێ گرت و چاومان بە ئۆپۆزسیۆنی عیراق کەوت کە ئەوانیش ئەنجومەنی باڵا و

بزووتنەوەی ویفاق و کۆنگرەی نیشتمانی و حزبی دەعوە و حزبی شیوعی بوون، خەلیلزاد پێشنیاریکرد چەند ناوێك لە ناوخۆوە بۆ پێکهاتەی ئۆپۆزسیۆن زیاد بکرێت، بۆیە پێشنیاری نەسیر چادرچی و عەبدولئیلا نەسراوی-مان کرد، گومانی ئەوەش هەبوو کە ئایا ئەمە ڕای ئیدارەی ئەمریکایە بۆ پێکهێنانی حکومەتی کاتیی یاخود ئەمە ڕای گارنەر و خەلیلزادە، لەبەر ئەمە فەرماندە سەربازیی و حکومییە ئەمریکاییەکان و هەروەها بەریتانیاییەکان و نێردراوی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا لە ئوتێلێك لە بەغدا کۆکرانەوە و ئەمانە ڕەزامەندییان ڕاگەیاند بۆ ڕاسپاردنمان بە پێکهێنانی حکومەتی کاتیی، مانگێك تێپەڕی بەبێ ئەوەی حکومەت پێکبهێنین تا ئەوکاتەی بریمەر ڕەوانە کراو گارنەر و خەلیلزاد لە عیراق کێشرانەوە، بریمەر هات کە وەك جێگری پاشا هەڵسوکەوتی دەکرد وەك ئەوەی ماڤ هەبێت چی دەوێت لە عیراقدا بیکات، بۆیە بیرۆکەی پێکهێنانی حکومەتی کاتیی هەڵوەشاندەوە، پاشان بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش دەرچوو کە عیراقی بە داگیرکراو دانا و ماڤ ئەوەی دا بە هێزەکانی ئەمریکا وەك هێزی داگیرکەری عیراق هەڵسوکەوت بکەن، ئەمەش یەکەم هەڵەی گەورەی ئەمریکا بوو».

تاڵەبانی پێیوایە "ئەگەر حکومەتەکە پێکبهێنرایە ڕەوشی ئەمنی عیراق دەگۆڕا، چونکە عیراقییەکان ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە ئەمریکاییەکان وەك داگیرکەر هاتوون نەك وەك ڕزگارکەر و ئازادکەر و حاکمێکی مەدەنی هەیە بەناوی داگیرکەرەوە، تەنانەت لەبیرمە لەمیانی کۆبوونەوەیەکماندا لەگەڵ هەردوو سەرکردایەتیی ئەمریکا و بەریتانیا، دکتۆر ئەحمەد چەلەبی بە

بەریتانیاییەکانی وت کە ئەوانیش بەرهەڵستی پێکهێنانی حکومەتێکی نیشتمانی کاتییان دەکرد: «مس بیل لە ئێوە باشتربوو، چونکە لە ساڵی 1922دا هات و حکومەتێکی نیشتمانیی پێکهێنا و ئێوەش ئەمڕۆ بەرهەڵستی پێکهێنانی ئەم حکومەتە دەکەن». من باوەڕم وایە ئەمە خاڵی سەرەتای ناکۆکی نێوان چەلەبی و داگیرکەر بوو". کاتێکیش لەبارەی ئەوەی لە کتێبەکەی بریمەردا (ساڵەکەم لە عیراق) سەبارەت بە سەرکردە کوردەکان هاتبوو پرسیارمان لێکرد، وەڵامی دایەوە: «بریمەر ڕاستگۆ نەبووە لە کتێبەکەیدا کە هەڵەی زۆری تێدایە».

ئەوە لە بارەی سەرۆك تاڵەبانی زانراوە کە پابەند نابێت بە پرۆتۆکۆلەوە، بەتایبەتی لەگەڵ هاوڕێیانی لە سەرکردەکانی دەوڵەتان یاخود میواناندا، چونکە وەك خۆی چۆن بووە وا هەڵسوکەوت دەکات بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك، ئەو ویستی وێنە باوەکەی سەرۆك کۆمار لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بگۆڕێت یاخود بڵێین بەلانی کەمەوە ئەوەی لە عیراقدا باوبووە، لەگەڵ تیمێکی پاسەوانیی بچووکدا دەچێتە دەرەوە، خۆی پێشوازی لە میوانەکانی دەکات و تا دەرگایماڵەکەی ماڵئاواییان لێدەکات، دڵخۆش دەبێت کاتێك بە «مام جەلال» بانگی دەکەیت، دەستت دەگرێت و بەرەو ئەو شوێنەت دەبات کە لێی دادەنیشێت. کاتێکیش سەبارەت بە هۆکاری دەرچوونی لە پرۆتۆکۆلەکان پرسیارم لێکرد، لە وەڵامدا وتی: «من وەك سەرۆك لە پرۆتۆکۆل و ڕیتمی وێنەی سەرۆك دەرچووم، من هەستم بەهیچ جیاوازییەك نەکرد کە بوومە سەرۆك کۆمار، بۆچی ئەم جیاوازییە هەبێت؟ سەرۆکایەتی بەرپرسیارێتی پۆستێکە کە سەرۆك پەیڕەوی دەکات، من لەو باوەڕەدام کە مرۆڤ بەها

دەبەخشێتە پۆست نەك بەپێچەوانەوە، چونكە من هەڵسوكەوتم نەگۆڕی چ لە سەرۆكایەتی یاخود لە دەرەوەی سەرۆكایەتی وەك مرۆڤێك و وەك جەلال تاڵەبانی، بۆیە من بەرپرسیارێتییەكانم وەك سكرتێری گشتیی حزبێكی سیاسی عیراقی كوردی پەیڕەو دەكەم هەروەها بەرپرسیارێتییەكانیشم وەك سەرۆكی عیراق، و هیچ قورسییەك نابینم لە گونجاندنی بەرپرسیارێتییەكانمدا، چونكە لەیەكەوە نزیكن و بەرپرسییارێتیی نیشتمانین و گرنگن بۆ عیراق و بۆ گەلەكەشمان بە پلەی یەكەم». بەڵام تاڵەبانی بەڕاشكاوی دان بەوەدا دەنێت كە قورسییەك دەبینێت لەوەی كە بەخێوكەری خێزانێكە، ئەویش لەبەرئەوەی بەرپرسیارێتییە سیاسی و سەرۆكایەتییەكانی كاتێكی زۆر یاخود تەنانەت كەمیشی پێنادەن بۆ بینینی خێزانەكەی و دەڵێت: «بەڵام قورسییەكە لەوەدایە كە بەخێوكەری خێزانێكم، چونكە كوڕەكانم لە دەرەوەی عیراقن و هیرۆخانی هاوسەرم لەنێوان بەغدا و سلێمانیدا هاتووچۆ دەكات، لەبەر ئەمە یەكێك لە هۆكارەكانی سووربوونم لەسەر مانەوەم لە سلێمانی، بە مەبەستی كۆكردنەوەی خێزانەكەم و ئامادەبوونمە لەنێویاندا».

عیراقییەكان لە سەردەمی ڕژێمی سەدام حسێندا بە چرپە و وریاییەكی زۆرەوە نوكتەی سیاسییان بۆیەك دەگێڕایەوە، چونكە نوكتە لەوكاتەدا لەوانەبوو ببێتە مایەی ئیعدامكردن یاخود بەندكردنی هەتاهەتایی یان ئەشكەنجەدان لەژێر زەمینی دەزگا ئەمنییەكاندا، بەڵام مام جەلال عیراقییەكانی سەرسام كرد كاتێك لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەركەوت و ئەو نوكتانەی دەگێڕایەوە كە لەسەر خۆی وترابوون، بگرە خۆی هەندێك نوكتەی لەسەر خۆی دروست دەكرد، ئەوەی سەرۆك تاڵەبانی

ناسیبێت بەر لەوەی بەرپرسیارێتی سەرۆکایەتیی کۆماری عیراقی پێبسپێردرێت ئەوا درك بەوە دەکات کە مام جەلال نەگۆڕاوە، چونکە هەر لەو سەردەمەوە کە پێشمەرگە بوو لە شاخ نوکتە دەگێڕێتەوە یاخود لەو سەردەمەی کە سەرکردەی حزبێکی سیاسی بوو یان یەکێك بوو لە دیارترین سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن، دکتۆر فوئاد مەعسوم کە هاو سەردەمی بووە لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانیدا، پێمان دەڵێت: «ڕەنگە مام جەلال تاکە کەس بێت کە نوکتەی لەبەردەم مەلا مستەفای بارزانیدا دەگێڕایەوە یان گاڵتەی لەگەڵ دەکرد».

کەسە نزیکەکانی سەرۆك تاڵەبانی دەزانن کە مام جەلال پەنا بۆ گێڕانەوەی نوکتەیەك یان بەسەرهاتێکی خۆش دەبات هەر کە گفتوگۆکان لە مەسەلەیەکدا توندبوون ئەویش لەپێناوی هێورکردنەوەی کەش و هەواکەدا، یەکێك لە کەسە نزیکەکان کە بەشداریکردووە لە وەفدی وتووێژی نێوان سەرکردایەتی کورد و ڕژێمی سەدام حسێندا، لێیدەگێڕێتەوە کە کاتێك گفتوگۆکان سەبارەت بە کەرکوك توندبوون، تاڵەبانی داوایکردووە پشوویەك بدەن بۆ چاخواردنەوە و ئیسراحەت و پاشان دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ، لەکاتی پشووەکەشدا تاڵەبانی ویستوویەتی نوکتەیەك لەسەر جوحا بگێڕێتەوە کە بە کوردی مەلا نەسرەدین (مەلای مەشهوور، یان مەلای مەزبوورە)ی پێدەڵێن، بۆیە وتویەتی: «ڕۆژێك لە ڕۆژان مەلا نەسرەدین، کە لەنێو عەرەبدا بە جوحا ناسراوە، لەکاتێکدا کوردە و ناوی مەلا نەسرەدینە»، لێرەدا عەلی حەسەن مەجید هەڵیداوەتێ و وتوویەتی: «کاکە جوحا عەرەبە و بە ڕەچەڵەك عەرەبی کوفەیە و نە مەلا نەسرەدینە و نە کوردیشە. کاتێك مام جەلال دەبینێت عەلی حەسەن مەجید

تەنیا لەبەر گۆڕینی ناوی جوحا بۆ مەلا نەسرەدین هەڵیداوەتێ، بۆیە (تاڵەبانی) بڕیاری داوە تا کۆتایی بەردەوام بێت بۆ ئەوەی گاڵتە بە مەجید بکات و سووربووە لەسەر ئەوەی جوحا کوردە و ڕەچەڵەکی کوردە، لێرەشدا مەجید وتویەتی: «کاکە تەنانەت دەتانەوێت جوحاشمان لێبسەنن»، تاڵەبانییش زەردەخەنەیەکی کردەوە و بە هێمنی وتویەتی: «کاکە عەلی کەرکوکمان بدەنێ و جوحا ببەن بۆ خۆتان».

هەرکەسێك بچێت بۆ دیداری مام جەلال ئەوا باشترین دیاری لەگەڵ خۆی بۆی ببات، نوکتەیەکە چ لەسەر ئەو وترابێت یاخود لەسەر کەسێکی دیکە، پرسیارمان لێکرد لەبارەی ئەوەی چۆن ئاراستەکانی گۆڕیوە لە سەرۆکێکەوە کە هەر کەسێك نوکتەیەکی لەسەر وتبێت ئیعدامی کردووە بۆ سەرۆکێك خۆی نوکتە لەسەر خۆی بگێڕێتەوە، وتی: «ئەمە مەسەلەیەکی سروشتییە، چونکە سەرۆك مرۆڤە، نەك بوونەوەرێکی لە توانابەدەر یاخود جیاواز لە مرۆڤایەتی، ئەمڕۆ من سەرۆکم و سبەینێ دەبمە سەرۆکی پێشوو، بۆچی سەرۆکایەتیی کەسێك دەکات بە خۆبەزلزان و جیاواز؟ من مرۆڤێکی ئاساییم و حەزم لە نوکتەیە چ لەسەر خۆم بێت یان لەسەر کەسانی دیکە، ئەمە پێش سەرۆکایەتیش هەروابووە».

ئەمڕۆ سەرۆك تاڵەبانی ئاواتەخوازە خانەنشین بێت لە ئەرکەکەی وەك سەرۆك کۆماری عیراق، بەڵام ڕەوتە سیاسییەکان و سەرکردە سیاسییە سەرەکییەکان لە عیراق سوورن لەسەر مانەوەی، چونکە ئەو پیاوی گونجاندن و پێکەوەژیانی نیشتمانییە، کاتێکیش پرسیارمان لێکرد لەبارەی ئەو سەرۆکەی جێی دەگرێتەوە کورد دەبێت یان عەرەب، وتی: «مەرج نییە سەرۆکی عیراق کورد بێت، بەڵکو پێویستە جگە لەو خەسڵەتە مرۆیی و سیاسییانەی و سیفەتە پێویستەکانی دیکە کە هەیەتی، دەبێت پیاوی گونجاندنی نیشتمانی بێت و قبوڵکراو بێت لەلایەن ڕەوتە سەرەکییەکانی پەرلەمانەوە و توانای لێکنزیککردنەوەی بۆچوونەکان و ڕۆڵگێڕانی لە ئاشتبوونەوەی نیشتمانیدا هەبێت، هەروەها توانای ڕۆڵگێڕانی هەبێت لە هێنانەکایەی حکومەتی یەکێتیی نیشتمانیی لە ڕێگەی نزیککردنەوەی بۆچوونی نێوان قەوارە جیاجیاکان لە عیراقدا، هەرچی سەبارەت بە ڕایەکەی ترە، کە ئەویش ئەوەیە پێویستە

سەرۆك عەرەب بێت، ئەوا پێچەوانەی چەمکی یەکێتیی نیشتمانییە، چونکە مەرجی سەرەکی لە چەمکی یەکێتیی عیراقدا ئەوەیە هەموو هاوولاتییان وەك یەکن لە ماف و ئەرکدا، لەبەرئەوە هەموو عیراقییەك مافی ئەوەی هەیە ببێتە سەرۆك یان سەرۆك وەزیران، ئەگەر مەرجەکانی ئەو دوو پۆستەی تێدابێت.

جیاکردنەوەی کورد، لەم پۆستە یان ئەو پۆستە بەبیانووی ئەوەی کوردە جیاکردنەوەیەکی شۆڤێنییانەیە و لەگەڵ چەمکی یەکێتیی نیشتمانیدا ناگونجێت و گیانی دەمارگیری نەتەوەیی و دژ بەکوردی هەلگرتووە. من دەمەوێت بڵێم کە گرتنە دەستی پۆستە سەرەکییەکان لە نیشتمانی عەرەبدا لەلایەن کوردەوە تازە نییە، باتێبینی بکەین چەند سەرۆك کۆماری سوریا لە کورد بووە و بەرهەڵستی نەکراوە لەبەرئەوەی کوردە، بەڵکو بەرهەڵستی لەسەر هەڵسوکەوتی یاخود ئەدای یان لەسەر هەڵوێستەکانی بووە، ئەم بەرهەڵستییە بیدعەیەکی تازەیە لەگەڵ عەفلەقیەت لە جیهانی عەرەبیدا سەریهەڵدا. عەفلەقیەت وەك پەتایەك، بەوپێیەی من ناوی لێ دەنێم، کۆمەڵێك بیری شۆڤێنی دژ و پەرتەوازەکەری یەکێتیی گەل و دژ بە بنەماکانی دیموکراسی لەگەڵ خۆی هێنا. تێبینی دەکەین لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا ئەوانەی ڕەگەزنامە وەردەگرن مافی ئەوەیان هەیە بەرزترین پۆست وەربگرن بەبێ بەرهەڵستیکردن لەسەر ڕەچەڵەکیان، کەواتە بۆچی لە عیراقدا مافی هەمووان نەبێت کە بچنە پۆستە گرنگەکان ئەگەر خەسڵەتەکانیان تێدا هەبێت. دەبێت کاتێك بەرهەڵستی بکەین کە سەرۆك لەڕێی کودەتای سەربازیی و هێنانی تانك و گۆڕینی سیستمی حوکمەوە بەبێ ویستی گەل هاتبێت، بەلام کاتێك سەرۆك لەلایەن زۆرینەی پەرلەمانەوە هەڵبژێردرابێت، مافی ئەوەی هەیە چی دەبێت ببێت».

سەرۆك تاڵەبانی لەو باوەڕەدایە کە سەردەمی کودەتای سەربازیی بەسەرچووە لە عیراقدا و دەڵێت: «من لەو باوەڕەدام کە سەردەمی کودەتای سەربازیی کە بەهێزی چەك و خوێن سەرۆك بهێنێت، بەسەرچووە، پێموایە هەموو سەردەمەکە چیتر کودەتای سەربازیی قبوڵ ناکات، ناڵێم ئەگەری ڕوودانی کودەتا لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا نییە یان هەندێك ئەفسەر ئەو خولیایە بکەوێتە سەریان و کارێکی دیکتاتۆری لەڕێی کودەتاوە ئەنجامبدەن، بەڵام دەڵێم سەردەمی کودەتای سەربازیی کۆتاییهات. بەداخیشەوە دەڵێم کە سەردەمی کودەتای سەربازیی لە عیراق ئەفسەرێکی کورد دەستیپێکرد کە ئەویش فەریق بەکر سدقی-یە کە یاریدەدەری سەرۆکی ئەرکانی سوپا بوو لە ساڵانی سییەکاندا، بەڵام ملکەچی داواکاریی چەند سەرکردەیەکی پێشکەوتنخوازی عەرەبی عیراقی جێبەجێکرد لە نموونەی خوالێخۆشبووان جەعفەر ئەبو تممەن و کامیل چادرچی، کە دوای ئەم کودەتایە دەسەڵاتیان گرتەدەست، ئەمەش سەرەتایەکی خراپ بوو، چونکە ئەمڕۆ جیهانگیریی ئەنجامدانی کودەتای سەربازی قبوڵ ناکات».

سەرۆکی عیراق بنەمای بەشداریکردن لە عیراق دووپاتدەکاتەوە و ڕوونیدەکاتەوە و دەڵێت: «ئێمە دەمانەوێت گوزارشت لە سروشتی پێکهاتەی گەلی عیراق بکەین، سەردەمی پاشایەتی دانی بە بوونی نەتەوەی کورد لە عیراقدا ناوە، ئەو دوو ئەستێرەیەی لە ئاڵای عیراقدا هەبوون لە سەردەمی پاشایەتیدا، نیشانە بوون بۆ هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورد، بەدرێژایی سەردەمی پاشایەتیش کورد پۆستی سەرەکییان لە دەوڵەت لەدەستدا بووە وەك سەرۆك وەزیران یان وەزیری بەرگری یاخود سەرۆکی ئەرکانی سوپا، تەنانەت شۆڕشی 14ی تەمموزی 1958 بە مادەی سێیەم دەستیپێکرد کە

دەڵێت عەرەب و کورد هاوبەشن لە عیراقدا و عیراق ناوی کۆماری عەرەب و کوردی لێنرابوو، نەمانبیستووە عیراق کۆمارێکی تەواو عەرەبی بێت لە عەرەبە شۆڤێنیەکانەوە نەبێت کە وڵاتیان بە پیلانگێڕییەکانیان وێران کردووە، لە دەستووری عیراقیشدا ئەم هاوبەشییە بە دەق هاتووە و بڕگەی بەشداریی عەرەب و کورد لە بەرنامەی دەستەی کۆنگرەی نیشتمانی عیراقەوە وەرگیراوە کە نیشتمانپەروەرە دیموکراتخوازەکان و حزبی سەربەخۆیی نەتەوەیی عەرەبی و بەرەی میللی لە خۆگرتبوو، ئەم دەستەواژەیە خاڵی هاوبەشیی نێوان هەموو عیراقییەکان بوو بەرلەوەی بیری شۆڤێنی و عەقلەقی زاڵبێت، لەبەرئەوە بە پشتبەستن بە بنەمای هاوبەشی، کورد مافی ئەوەیان هەیە ئەو پێگەیە یان ئەوی دیکە بگرن».

لە یەکێك لە بۆنەکاندا کە سەرۆك جەلال تاڵەبانی پێشوازی لە پێشمەرگە دێرینەکان کرد کە هەندێکیان لە شاخ شانبەشانی ئەو شەڕیان کردبوو و لە میانی پشوویەکی کورتدا پێشمەرگەیەکی بە تەمەن بەناوی «حەمە حزب» هاتە پێشەوە کە تفەنگێکی کەمێك کۆنی پێبوو تا سڵاو لە مام جەلال بکات، تاڵەبانی بە گاڵتەوە پێیوت: «من لێت زویرم، بۆچی ئەو تفەنگە بڕنەوەت فرۆشتووە کە بە دیاری پێمدابوویت؟» حەمە حزبیش کە باڵابەرز و لاواز و سمێڵێکی سپی هەبوو، لە وەڵامدا بەبێ زۆر لەخۆکردن وتی: «مام جەلال ئەوە ساڵانێك لەمەوبەر بوو، تائێستاش تفەنگم هەڵگرتووە بۆ بەرگریکردن لە شۆڕش، پاشان تۆ ئێستا سەرۆکی عیراقیت و وەکو جارانی شاخ کێشەمان بۆ دروست ناکەیت و دونیا لە ئاشتیدایە» بۆیە هەموو پێکەنین بە مام جەلالیشەوە کە بۆی ڕوونکردینەوە و وتی: «ئەمە لەو جەنگاوەرانەیە کە لەگەڵمدا بووە

و ڕۆژێك لە ڕۆژان دوودڵ نەبووە لەوەی ڕەخنە لە هەرکەسێك بگرێت بە منیشەوە، پاشان حەمە حزب سەری مام جەلالی ماچ کرد وەك چۆن ڕۆڵەی خێڵێك شێخەکەی ماچ دەکات و لەتەنیشتیەوە دانیشت. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاین ئەوەیە کە تاڵەبانی تائێستاش هەڤاڵانی خەباتی چەکداریی و شاخی لەیاد ماوە بەناوەکانیشیانەوە و هیچیانی لەبیر نەکردووە، هەروەك ئەندامانی حزبەکەشی لە یاد ماوە لەوانەی خەباتیان لەگەڵ کردووە.

ئەمە بۆنەیەك بوو بۆ ئەوەی تاڵەبانی نانی نیوەڕۆ لەگەڵ هەڤاڵە دێرینەکانی بخوات و پاش ئەوەی چایان خواردەوە چوونە هۆڵی کۆبوونەوەکان لە هاوینەهەواری دوکان، چونکە مام جەلال هیلاك نابێت لە کۆبوونەوە و لە نێوان کۆبوونەوەیەك و یەکێکی دیکەدا پێشوازی لە هەندێك وەفد یان میوان دەکات، تەنانەت کەسە نزیکەکانی دەڵێن «ئەگەر مام جەلال لە کۆبوونەوەیەك هیلاك بێت داوای کۆبوونەوەیەکی تر دەکات بۆ ئەوەی پشووبدات»، ڕۆژێکیان تاڵەبانی بەردەوام سەرۆکایەتیی زیاتر لە پێنج یان شەش کۆبوونەوەی کرد لە دوکان، کە کۆبوونەوەی یەکەم سەعات نۆی سەرلەبەیانی دەستپێکرد و کۆبوونەوەی شەشەمیش سەعات یانزەی شەو کۆتاییهات، دوای ئەم هەموو کۆبوونەوە و سەرقاڵیانەش بە زەردەخەنەوە دێتە دەرەوە. لەم بەشەدا سەرۆك تاڵەبانی باسی کۆبوونەوەکانی و مێژووی دانوستانەکانی لەگەڵ ڕژێمی پێشووی سەدام حسێندا دەکات.

لە زۆر بۆنەدا و تەنانەت بەبێ بۆنەش، مام جەلال قووڵیی ئینتیمایان وەك کورد بۆ عیراق دووپاتدەکاتەوە کە بەشێکی دانەبڕاون لە گەلی عیراق و هەستی نیشتمانپەروەرییان لە هەر

عیراقییەکی نیشتمانپەروەر کەمتر نییە، بگرە یەکەم ئامانجی شۆڕشی کورد «دیموکراتی بۆ هەموو عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کورد» بووە، ئەمە لە کاتێکدا بووە کە سەدام حسێن جەنگی لەدژی گوندە کوردییەکان بەرپا دەکرد، بۆیە لە ساڵی 1983دا لەکاتێکدا سوپای عیراق سەرقاڵی جەنگی عیراق- ئێران بوو، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان یەکلایەنە شەڕی ڕاگرت. تاڵەبانی دەڵێت: «لە ساڵی 1983دا ئێمە یەکلایەنە شەڕمان لەگەڵ هێزەکانی حکومەت ڕاگرت کە ئەوکاتە شەڕی عیراق- ئێران هەلگیرسابوو، تێبینی ئەوەمان کرد کە ئێران خاکی خۆی لە کۆنترۆڵی هێزەکانی عیراق ڕزگار کرد و ئەنجومەنی ئاسایشیش داوای ڕاگرتنی شەڕ و خوێنرشتنی کرد، بەڵام لایەنی ئێرانی سووربوو لەسەر درێژەدان بە جەنگ و داگیرکردنی عیراق، ئێمەش ڕازی نەبووین دەوڵەتێکی بێگانە خاکی عیراق داگیر بکات، بەو پێیەش شەڕکردنمان لە دژی هێزەکانی عیراق لاوازی دەکردن لەبەرامبەر هێزەکانی ئێران و بەرپەرچدانەوەیان ئەگەر بیانویستایە وڵاتەکەمان داگیربکەن، لەبەرئەوە ویستمان سوپای عیراق دڵنیا بێت کە لە پشتەوە لێی نادەین یاخود سەرقاڵی ناکەین لەکاتێکدا کە ئەرکی خۆی ڕادەپەڕاند لە بەرگریکردن لە نیشتمان بەتایبەتی کە پەیوەندیمان لەگەڵ هەندێك ئەفسەری ئازادیخواز لە سوپای عیراقدا هەبوو و هاوئاهەنگیمان لەگەڵ دەکردن لە پێناوی گۆڕینی ڕژێمدا، بە بڕوای ئێمە ئەگەر ئێران جەنگی ڕابگرتایە و داوای قەرەبووی لە ڕژێمی سەدام حسێن بکردایە ئەوا سوپای عیراق سزای ڕژێمەکەی دەدا لەبەرئەوەی خستبوویە جەنگێکی هەڕەمەکیەوە و ببووەهۆی شکستیان و لە بەرامبەر هیچدا و زیانی لێداون».

هەروەها وتی: «من لە ڕوانگەی تێڕوانین و خەیاڵەوە قسە ناکەم، بەڵکو پەیوەندیمان لەگەڵ ئەفسەری گەورەی سوپای عیراق و چەند ئەفسەرێك لە هەبوو کە لەسەر باڵی چەپڕەوی حزبی بەعس حساب دەکران و ئامادەبوون بۆ کارکردن بۆ گۆڕینی ڕژێم و ئێمەش بەشێك دەبووین لە پرۆسەی گۆڕینەکە».

لە یەکەم دیداری نێوان تاڵەبانی و عیزەت دوری جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشدا، دوری پرسیاری لە تاڵەبانی کرد سەبارەت بە ژمارەی ئەو جارانەی کورد هەوڵی کودەتایان لە دژی ڕژێم داوە، تاڵەبانیش بە متمانەیەکی تەواوەوە وەڵامی دەداتەوە: «زۆرن».

هەروەها تاڵەبانی دەڵێت: «بە بەردەوامی هەوڵماندەدا ڕژێم بگۆڕین، تەنانەت بەر لە ئەنجامدانی دانوستان لەگەڵ حکومەتی بەعسدا، عیزەت دوری لێی پرسیم و وتی: «تو شەرەفت یەك هەوڵی کودەتا هەیە بەشداریتان تێدا نەکردبێت؟ منیش وەڵامم دایەوە: «نە بەخوا ئێمە بەشداریمان لە هەموو هەوڵێکی کودەتادا کردووە لە دژی ئێوە»، هەروەها وتی: « لە کودەتاکەیانەوە لە 17ی تەمموزی 1968 و هەر چەند ڕۆژێکی کەم دوای ئەوە، دەستمان بەکار کرد بۆ گۆڕینی ڕژێم، چونکە دڵنیابووین لەوەی حوکمیان کردۆتەوە تاکرەویی، لەبەرئەوە ئێمە و بەعسییە چەپڕەوەکانی سەر بە سوریا و بزووتنەوەی سۆشیالیستی عەرەبی دەستمانکرد بە کارکردن بۆ ئەنجامدانی کودەتا بەسەریاندا، چونکە ڕژێم و حزبی بەعس لاواز بوون و قسەمان لەگەڵ هەندێك ئەفسەری سوپای عیراق کرد بۆ ئەوەی کار بۆ گۆڕینی ڕژێم بکەین، بەڵام وەڵامیان نەبوو و هەوڵەکانمان دواکەوتن، بەڵام نەپچڕان. سەرکەوتوو نەبووین لەبەرئەوەی ئامرازەکانی جێبەجێکردن بەردەست

نەبوون، بۆ نموونە من قسەم لەگەڵ فەرماندەی فەیلەقێکی گرنگدا کرد بۆ ئەنجامدانی کودەتا، بەڵام داوای لێبوردنی کرد و وتی دەبێت ڕای عەبدولڕەزاق عارف وەربگرم (دووکەس هەن: یەکێکیان عارف عەبدولڕەزاق، ئەو پیاوە ویستی دژی عەبدولسەلام عارف کودەتا بکات و دووەمیشیان عەبدولڕەزاق ئەلنایف ـە کە لە دوای کودەتای 17ی تەمموز کرا بە سەرۆك وەزیران و لە ڕۆژی 30ی تەمموز، گرتیان و سەدام حسێن خۆی ڕەوانەی دەرەوەی کرد. بەڵام عەبدولڕەزاق عارف، ڕەنگە لە گواستنەوەی ناوەکەدا هەڵە ڕووی دابێت) و کاتێکیش ڕۆیشت بۆ ئەوەی ڕەزامەندی وەربگرێت، عارف لەلایەن بەعسییەکانەوە دەستگیرکرابوو». هەروەها لەدرێژەی قسەکانیدا وتی: «دوا هەوڵ ماوەیەکی کەم پێش ڕووخانی ڕژێم بوو کە هەندێك ئەفسەری سوپامان لەگەڵدا بوو لەوانە عەبدولکەریم حەمدانی و پێش ئێمەش یەکێك لە برادەرانی لەگەڵ بوو بەهاوئاهەنگیش لەگەڵ هێزێکی سەربازی کە لە بەغدا بوو، بەڵام هەوڵەکە ئاشکرا بوو و حەمدانی ئیعدام کرا و یەکێك لە هەڤاڵەکانیشی لەگەڵدا بوو، ئەو هەوڵە سەرکەوتوو دەبوو ئەگەر ئەو برادەرانەی پلانەکەیان جێبەجێ دەکرد بە وشەی جفرە قسەیان بکردایە لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانیاندا کە چاودێرییان لەسەر بوو، بۆیە دەزگاکانی سەدام گومانیان لە مەسەلەکە کرد و ئەو گرووپە دەستگیرکران کە بە تەمابوون کودەتاکە جێبەجێ بکەن».

بەڵام هەڵوێستی یەکێتیی نیشتمانیی بە ڕاگرتنی یەکلایەنەی شەڕ لە ساڵی 1983دا هەرچەندە هێز و کاریگەریی سەربازیی خۆی هەبوو، دەرگای لەبەردەم دانوستان لەگەڵ ڕژێمی سەدام حسێن کردەوە، تاڵەبانی باسی ئەوە دەکات و لەوبارەیەوە دەڵێت: «لەلایەن خۆمانەوە قۆناغێکی نوێمان لە دانوستان لەگەڵ ڕژێم دەستپێکرد کە لەلایەن ئێمەوە دکتۆر فوئاد مەعسوم، دانوستانەکانی بەڕێوەدەبرد لەکاتێکدا لەلایەن ئەوانەوە عەلی حەسەن مەجید، سەرۆکایەتیی وەفدی حکومەتی دەکرد، لە دانیشتنی یەکەمدا کە سەدام حسێن ئامادەیبوو، پێیوتم: شتێکتان دەدەمێ کە لەبەردەم کوردی تورکیا و ئێراندا سەرتان بەرزبکاتەوە، وتمان بابیبینین».

وەفدی کوردی گەشبین بووە بە گەیشتن بە چارەسەری ئیجابی و لەوبارەیەوە تاڵەبانی دەڵێت: «لەم دانوستاندنەدا گەیشتینە نیمچە ڕێککەوتنێك لەسەر هەموو خاڵەکان جگە لە دووخاڵ، یەکەمیان مەسەلەی سنووری کوردستان بوو، چونکە ڕژێم ناوینابوو ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان، دووەمیشیان ژمارەی هێزی پێشمەرگە بوو، عیزەت دووری و عەلی حەسەن مەجید هاتن بۆ لامان لە ناوچەی سورداش کە بارەگاکەمان لەوێبوو، ڕێککەوتین لەسەر هەموو خاڵەکان لەنێویشیاندا هەڵوەشاندنەوەی فەوجەکان یان ئەوانەی پێیاندەوتن فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی (ئەمانە چەند کۆمەڵێك جەنگاوەری کوردبوون هاوکاری حکومەتیان دەکرد) بەمەرجێك هیچ شتێك دەرهەق بە ڕەمزەکانیان نەکەین، هەردوو خاڵی سنوور و پێشمەرگە مانەوە، بۆیە دووری وتی: وەرن بۆ بەغدا، چونکە ئەمە لە دەسەڵاتی ئێمەدا نییە، منیش چووم بۆ بەغدا و لەگەڵ سەدام حسێن

کۆبوومەوە بە ئامادەبوونی عیزەت دووری و مەجید، سەدام وتی: من ڕازیم لەسەر ئەو ڕێککەوتننامەیەی پێیگەیشتوون هەرچەندە شتێکی کەم نییە ڕازیبم بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو گرووپانەی هاوکارییان کردووین کە مەبەستی فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی بوو، پاشان لێیپرسیم: ئێستا دەمەوێت تۆ پێم بڵێیت چی دەمێنێت؟ منیش پێموت: ئایا بەڵێنەکەتان لەبیرە بەوەی کە شتێکمان دەدەنێ لەبەردەم کوردی تورکیا و ئێراندا سەرمان بەرزبکاتەوە؟ وتی: بەڵێ من لەسەر بەڵێنی خۆمم، وتم: بۆ ئەوەی لەبەردەم کوردی تورکیا سەرمان بەرزبکەیتەوە داواکارین هەردوو قەزای شێخان و ئاکرێ بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی زیاد بکرێن، ئەویش وتی: من ڕازیم، وتم: بۆ ئەوەی لە بەرامبەر کوردی ئێرانیشدا سەرمان بەرزبکەیتەوە ئەوا داواکارین هەردوو قەزای خانەقین و کفری بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی زیاد بکرێن، وتی: ڕازیم، بەڵام مەسەلەی خانەقین دوادەخەین تا جەنگ کۆتایی دێت، چونکە دەکەوێتە ناوچەی چالاکی سەربازییەوە و دوای کۆتایی جەنگ دەخرێتەسەر ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردستان».

هەروەها تاڵەبانی وتی: «سەبارەت بە ژمارەی هێزی پێشمەرگەش، (سەدام) وتی: ئەوەندەی دەتوانرێت ڕێکبخرێن ئێمە ڕازین، منیش وتم: 50 هەزار جەنگاوەر، وتی: چۆنت دەوێت با وابێت، پاشان وتی: لەسەر خێر و تەوفەمان کرد و پێیوتم: خۆڕاگربە سەرکردە دەبێت بوێربێت و لە هیچ نەترسێت، پاشان پرسیاری لەبارەی وادەی ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە کرد، ئەو ڕۆژەی تێیدا ڕێککەوتین سێشەممە بوو، بۆیە سەدام حسێن پێشنیاری کرد کە ئیمزاکردنەکە ڕۆژی پێنجشەممە بێت، منیش پێموت: بابیخەینە ڕۆژی شەممە، چونکە برادەران لە دهۆك و

هەولێر و سلێمانین بۆ ئەوەی ناوی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی عیراق (پەرلەمان)ی ئەوکاتە کۆبکرێتەوە، حکومەتیش ڕاگەیاندنی وادەی هەڵبژاردنی دواخستبوو لە چاوەڕوانی کاندیدەکانی ئێمەدا، ئەویش وتی: کەواتە با ڕۆژی شەممە بێت، پاشان لەبەردەم مندا پەیوەندی کرد بە لەتیف نسەیف جاسم وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنەوە و پێیوت: خۆتان ئامادەبکەن ڕۆژی شەممە ئاهەنگ هەیە و جەلال تاڵەبانیم لەگەڵدایە، تێگەیشتی مەبەستم چییە؟ منیش گوێم لە گفتوگۆکەیان بوو لەکاتێکدا جاسم وەڵامی دایەوە: بەڵێ گەورەم تێگەیشتم».

تاڵەبانی وتی: «پاشان بۆ ڕۆژی دواتر بانگهێشتیان کردین بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ و ڕۆژی هەینیش هاتن بۆ ئوتێل شیراتۆن بۆ سەردانمان، سەرلەبەیانی ڕۆژی شەممە پەیوەندیم کرد بە عیزەت دوورییەوە و لێمپرسی: ئەبو ئەحمەد بێین بۆلاتان؟ چونکە ڕۆژی ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە بوو، ئەویش وتی: بەڵێ بفەرموون و ڕۆیشتین لەوێ لەلای دەروازەی کۆشکی کۆماری چاوەڕوانمان بوو، گەیاندینیە نووسینگەکەی و وتی: ئەمە نووسینگەی خۆتانە و ئیسراحەتی خۆتان وەربگرن، من دەچم بۆ ئەوەی برادەران بێنم بۆ ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە».

بەڵام ئایا ڕێککەوتننامەکە بە کردەوە ئیمزا کرا؟ تاڵەبانی ئەوە ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت: «پاش ماوەیەك دووری چۆن ڕۆیشت هەروا نەهاتەوە، بەبێ تاقەتی و بە ساردییەوە لەپشت مێزکەیەوە دانیشت، منیش لێمپرسی چی ڕوویداوە: ئەویش وتی: برادەران دەڵێن خاڵێکی کۆتایی ماوە دەبێت چارەسەری بکەین، لێمپرسی لەبارەی چ خاڵێکەوە قسە دەکات، ئەویش وتی: مەسەلەی بەرەی نیشتمانییە و دەبێت بچنە ناو بەرەی نیشتمانییەوە، پێموت:

سەرۆك سەدام حسێن وتی: ئێمە بەدرێژایی دووساڵ لەگەڵ شیوعییەکان وتووێژمان کرد بۆ ئەوەی بێنە ناو بەرەکەوە، با لەگەڵ برایانیشدا (مەبەستی ئێمە بوو) یەك ساڵ گفتوگۆ بکەین»، هەروەها تاڵەبانی وتی: «بەڵام من هیچ کاردانەوەیەکم لێنەبینی، زانیبوومان کە وەفدێکی سەربازیی تورکیا ئەو ڕۆژە سەردانی بەغدای کردبوو، منیش پێموت: ئەبو ئەحمەد دیارە تورکەکان ڕێککەوتننامەکەیان تێکداوە؟ چونکە ئێمە دەزانین کە تورکیا نایەوێت حکومەتی عیراق هیچ ڕێککەوتننامەیەکمان لەگەڵدا ئیمزا بکات تا مافەکانمان بەدەست نەهێنین و بەوپێیەش کوردی تورکیا گوشاریان دەخەنە سەر نەوەك ئێمە داوای مافەکانیان بکەن، وەفدەکەی تورکیاش هەڕەشەی ئەوەی لە حکومەتی عیراق کردبوو کە ئەگەر ڕێککەوتننامەکە لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئیمزا بکەن، ئەوا جموجوڵی هاوردە و هەناردەکردن ڕادەگرێت، تورکیاش دەروازەیەکی هاتنەناوەوەی جۆرەها کەلوپەل و هەناردەکردنی نەوت بوو لەکاتێکدا گەمارۆ هەموو دەرگاکانی بەڕووی عیراقییەکاندا داخستبوو، دووریش وەڵامی دامەوە و وتی: «نەفرەت لە تورکەکان و ئەو کەسەش کە هێنانی بۆ ئێرە». هەروەها تاڵەبانی وتی: "دووری «ئاوڕی لێدایەوە و وتی: تکام وایە دانوستان لەنێوانماندا کۆتایی پێ نەیەت، منیش وتم: نا کۆتایی پێنایەت! پاشان داوای لێکردین کە شەڕ دەستپێنەکەین و وتی: تکام وایە شەڕ دەستپێنەکەنەوە، منیش پێموت: ئێمە شەڕ دەستپێناکەینەوە هەتا سوپای عیراق لە جەنگدا بێت و سەرقاڵی جەنگ بێت، دوای ئەوەش کارەکە بۆ ئێوە دەگەڕێتەوە کە مافەکانمان پێدەدەن یاخود شەڕ بکەین، ئەویش وتی: سوپاس بۆ ئەم هەڵوێستە نیشتمانییە و ئومێدەوارین هەڵبژاردنی

پەرلەمانمان لێ تێکنەدەن، منیش وتم: ئێمە دەستوەرنادەینە مەسەلەی هەڵبژاردن ئەگەر ئێوە نەمانوروژێنن و نەیەنە ناوچەکانمان، چونکە ناوچەی ئازادکراومان هەبوو، ئەویش بەڵێنی دا نەیەنە ناوچەکانمان».

هەروەها تاڵەبانی وتی: «بەم جۆرە ئەم خولەی دانوستان کۆتایی هات، دوای ئەوە دڵنیابووین لە پێشبینییەکەمان ئەویش ئەوەبوو وەفدەکەی تورکیا هەڕەشەی ئەوەی لە حکومەتی عیراق کردبوو کە ڕێگای نێوان تورکیا و عیراق دادەخات و حکومەتی عیراقیش ملکەچی هەڕەشەکەی تورکیا بوو لە بەڵێنەکانی پاشگەزبووەوە، ئێمە کاتێك دەڵێین حکومەت ئەوا مەبەستمان سەدام حسێنە، پاشان وڵاتە یەکگرتووەکانیش بەڵێنی ئەوەی دابوو بە عیراق کە ڕێگەنەدا ئێران خاکی عیراق داگیربکات و ڕژێمی سەدام حسێنیش دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت، ئەمەش وایکرد لەخۆیان دڵنیابن و بەوپێیەش هەستیان بەوەکرد کە پێویستیان بە ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە نییە لەگەڵ ئێمە».

بەڵام چی دەبوو ئەگەر ڕۆژی پێنجشەممە ڕێککەوتننامەکەتان لەگەڵ حکومەتی عیراق ئیمزا بکردایە هەروەکو سەدام حسێن پێشنیاری کرد؟ واتە بەرلە گەیشتنی وەفدە سەربازییەکەی تورکیا، ئایا پابەند دەبوون پێوەی؟ تاڵەبانی وەڵامی دایەوە و وتی: «ئێمەش بیرمان لەم پرسیارە کردەوە و وتمان: ئەگەر ئیمزاکردنەکەمان دوانەخستایە تا ڕۆژی شەممە، دەبووایە چی ڕووی بدایە؟ وەڵامەکەش ڕوونبوو کە سەدام لە ڕێککەوتننامەکە پاشگەز دەبووەوە لە بەرامبەر ملکەچبوونی بۆ هەڕەشەکانی تورکیا».

تاڵەبانی باسی دووری جێگری سەدام حسێن دەکات و بە پێچەوانەی ئەوەی لەبارەیەوە دەوترا، وەسفی دەکات و دەڵێت:

«عیزمت دووری بە پێچەوانەوەی ئەوەی لەبارەیەوە دەوترا، پیاوێکی زیرەکە و دەزانێت حکومەت یاخود ڕژێم چیدەوێت، بەڵام بەشێوەیەکی ڕەها دڵسۆزی سەدام حسێن بوو، دەسەڵاتیشی سنووردار بوو، لەبەرئەوە هیچ بڕیارێکی بەدەست نەبوو، چونکە بڕیاری کۆتایی لە هەموو کاروبارەکاندا بەدەست سەدام حسێن خۆی بوو». هەروەها تاڵەبانی ڕوونیدەکاتەوە «ئەوانەی زۆرتر ڕقیان لە کوردە و لە سەرکردایەتی سەدامیدا لەدژی کورد دنەیاندەدا، عەلی حەسەن مەجید (ئامۆزای سەدام) و حسێن کامل (زاوای سەدام)ن».

تاڵەبانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە «یەکێك لە مەترسیدارترین خاڵی لاوازی سەدام حسێن ئەوەیە کە بیر لە زامنکردنی دراوسێکان دەکاتەوە لە بەرامبەر ئەوەی مافە ڕەواکان نەداتە کورد، تێبینی بکە لە ڕێککەتننامەی جەزائیردا شەتولعەربی لەدەست دەرچوو لەپێناوی ئەوەی شای ئێران دەست لە یارمەتیدانی شۆڕشی کورد هەڵبگرێت و ملکەچی هەڕەشەکانی تورکیاش بوو بۆ ئەوەی ڕازییان بکات و کورد بخنکێنێت، لەبری ئەوەی بایەخ بە فاکتەری ناوخۆ بدات و گەلەکەی و هاووڵاتییانی و وڵاتەکەی ڕازی بکات و ئۆتۆنۆمی بدات بە کورد و بەڵێنەکانی جێبەجێ بکات کە پێیدابوون، دەستبەرداریان دەبوو بۆ بێگانە»، هەروەها وتی: «ئەگەر مافەکانی بدایە بە کورد کە عیراقین، ئەوا عیراقی بەدوور دەگرت لە دەستبەرداربوون لە بەشێکی گەورەی شەتولعەرب و هەندێك خاکی ئێرانیش، هەروەها گەلی عیراقیشی بەدوور دەگرت لە جەنگی عیراق- ئێران کە بەسەدان هەزار لە لاوەکانمانی تێدا بوونە قوربانی و ژێرخانی ئابووری وێران کرد، ئەو جەنگەی کە سەدام حسێنی ڕاکێشا بۆ داگیرکردنی کومیت و ئەنجامەکەشی ئەوەبوو

وڵاتانی هاوپەیمان عیراقیان بۆردومان کرد و گەمارۆیان بەسەردا سەپاند».

تاڵەبانی ئەم خولەی دانوستاندنەکان وا وەسفدەکات کە سەرکەوتووترینیان دەبوو ئەگەر بەئەنجام بگەیشتایە و دەڵێت: «ئەم خولەی دانوستاندنەکان گیانی ڕاشکاویی بەسەردا زاڵبوو، ئەگەر بەئەنجام بگەیشتایە و ئەگەر سەدام حسێن جدی بووایە ئەوا عیراقی لە زۆر کارەسات دەپاراست، چونکە لەم ڕێککەوتننامەیەدا باسی کەرکوکمان کردبوو، سەدامیش ڕاشکاوانەبوو لەگەڵمان و وەك تارق عەزیز یاخود عەلی حەسەن مەجید نەبوو کە خۆیان بەدەستەوەنەدەدا و پێچ و پەنایان دەکرد لەکاتێکدا سەدام زۆر ڕاستەخۆ بوو».

هەروەها تاڵەبانی لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: «سەدام حسێن دەیزانی من خەڵکی کەرکوکم و ئەو وتارەیم بەبیرهێنایەوە کە لە هەولێر پێشکەشی کرد و تێیدا لێبوردنی بۆ دەرکردم، چونکە بنەماڵەکەمان کە تاڵەبانییە پێشوازییان لە باب و باپیرانی کردبوو کاتێك لە تکریتەوە هەڵاتبوون بۆ کوردستان و بەگوێرەی قسەی ئەو: دووساڵ لە دەشت و دۆڵی کوردستان بەڕێزەوە ژیاون (باب و باپیرانی سەدام)، بۆیە ئەو ناوی کوردستانی لەو ناوچانە نابوو کە بنەماڵەکەمانی تێدا نیشتەجێبوو، بنەماڵەکەشمان نیشتەجێی کەرکوك بوو، لە باشووری قەزای داقوق، ئەمەش مانای ئەوەیە دانی بەوەدا ناوە کە سنووری کوردستان لەوێوە دەستپێدەکات، ئەگەر بنەماڵەکەمان لە ناوچەی ئاڵتون کۆپری نیشتەجێبووایە ئەوا سنووری کوردستان هەر بەپێی دانپێدانانی ئەو لە ئاڵتون کۆپرییەوە دەستپێدەکرد»، هەروەها دووپاتی کردەوە و وتی: «بەکورتی ئەمە مانای ئەوەیە کەرکوك دەکەوێتە چواچێوەی سنووری کوردستانەوە، بێگومان ئەو ئەم ڕایەی منی بیستبوو کە

له یەکێك له خولەکانی دانوستاندندا دەرمبڕیبوو، بۆیه پێیوتم: کاکه جەلال گوێبگره، من نالێم کەرکوك کوردستانی نییه و ناشلێم عەرەبییه، کەرکوك عەرەبی نییه، بەلام شارێکی عیراقییه و من دەزانم که کەرکوك دەبێته فاکتەری ئابووری بۆ جیابوونەوەتان له عیراق، من نامەوێت ناسنامەی کەرکوك بگۆڕم، بەڵکو پەرۆشی ئەوەم که له ئێوه عیراق و یەکپارچەیی نیشتمانی جیانەبنەوە، لەبەرئەوه من ڕازی نیم بخرێته سەر سنووری کوردستان، بەلام ڕازیم لەسەر ئەو مەرجانەتان که پەیوەندیدارن به ئاساییکردنەوەی بارودۆخ له کەرکوك، وەك گەڕانەوەی ناوه کوردییەکانی گەڕەك و شەقامەکان و کورده ڕاگوێزراوه بگەڕێنەوه بۆ ناوچەکانیان له کەرکوك و گێڕانەوەی کۆچپێکراوه عەرەبەکان بۆ شارەکانیان له ناوەڕاست و باشووری عیراق، پاشان ئیدارەی کەرکوك هاوبەش دەبێت، بۆیه ئەگەر پارێزگار عەرەب بێت ئەوا سەرۆکی شارەوانی کورد دەبێت و ئەگەر بەڕێوەبەری ئاسایش عەرەب بێت ئەوا بەڕێوەبەری پۆلیس کورده، و ئیتر ئاوا، ئێمەش وتمان: ئێمه بەوه ڕازین».

هەروەها تاڵەبانی وتی: «سەدام دەسەڵاتی نوێی بۆ یاسای ئۆتۆنۆمی زیادکرد و بەم وردەکارییانەشەوە ڕێککەوتننامەکە دەردەچوو ئەگەر ئیمزا بکرایە». تاڵەبانی وتی: «سەبارەت بە مەسەلەی دیموکراسیش، سەدام وتی: ڕازیم، هاوپەیمانی ئێوە، حزبی شیوعییە، بۆیە داوایان لێدەکەم بگەڕێنەوە بۆ ناو بەرەی نیشتمانی و حوکمیش ئیئتیلافی بێت لە نێوانماندا، بەڵام بەداخەوە بەهۆی هەڕەشەکانی تورکیا و دڵنیاکردنەوەی سەدام لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە بەوەی ڕێگە نادەن ڕژێمەکەی بڕووخێت هەموو ئەمانە کۆتاییان هات».

لە مام جەلال دەپرسین ئایا سەدام حسێن یەکەم بەرپرسی گەورەی عیراقییە ناوی کوردستانی لە ناوچە کوردییەکان ناوە، ئەویش دەڵێت: «سەدام حسێن یەکەم سەرۆك یاخود بەرپرسی عیراقی نەبوو کە بە ناوچەکانی باکووری عیراق بڵێت کوردستان، ئەم ناوە لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقەوە هەبووە، مەلیك فەیسەڵی یەکەم ناوی کوردستانی لێنابوو، هەموو حکومەتە یەك لەدوا یەکەکانی عیراقیش بەبێ لەڕوودامان ئەم ناوەیان بەکارهێناوە، لە ساڵی 1930یشدا حکومەت بەڕێوەبەرایەتی مەعارفی کوردستانی دامەزراند کە سەنتەرەکەی لە کەرکوك بوو و سەرپەرشتی هەموو قوتابخانەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆکی دەکرد، ئەمەش دووپاتکردنەوەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوەی کە کەرکوك دەکەوێتە چوارچێوەی کوردستانەوە، هەروەها نوری سەعید و جەعفەر عەسکەری و موحسین سەعدون-یش ناوی کوردستانیان بە ناوچەکانمان دەوت و ئەمەش کارێکی ئاسایی بوو، ئەم ناوەش نە لە سەردەمی پاشایەتی و نە لەسەردەمی قاسمدا قەدەغەکراو نەبوو، سەدام

زۆرجار دەیوت کوردستانی ئازیزمان، بگرە ئەربیلی بە ناوە کوردییەکەی دەناسی و پێیدەوت (هەولێر) و زۆر ڕووخۆشبوو لەگەڵ کورددا و خۆی بە ئەندازیاری ئۆتۆنۆمی دادەنا، تەنانەت جلوبەرگی کوردیشی لەبەر کرد کە من ئەو جلوبەرگەم بەدیاری بۆ ناردبوو و بریتی بوو لە قاتێکی جوتیارانە، کاتێکیش بەوەی زانی سەبارەت بە هۆکاری ئەوە لێی پرسیم بۆچی قاتێکی کوردی جوتیارانەم بۆ ناردووە، منیش پێموت، چونکە ئێوە لە ناوەندێکی جوتیارانەوە شۆڕبوونەتەوە و زۆر جار لە قسەکانتاندا داکۆکی لە جوتیاران دەکەن».

کاتێکیش لە سەرۆك تاڵەبانیمان پرسی سەبارەت بەوەی ئایا سەدام حسێنی بینیوە دوای دەستگیرکردنی یان نا و ئایا لێبووردنی بۆ دەردەکرد و لە سزای لەسێدارەدان ڕزگاری دەکرد؟ لە وەڵامدا وتی: «کاتێك سەدام حسێن دەستگیرکرا تەنیا ئەوەم دووبارە دەکردەوە کە شاعیری گەورە جەواهیری وتوویەتی: «بئس الشماتة شیمة» سەبارەت بەوەش کە لێبوردن بۆ سەدام دەربکەم یان نا ئەوە مافێکی ئەنجومەنی سەرۆکایەتییە و -تائێستاش- ماق ئەوەم نەبووە کە بەشێوەیەکی تاکڕەوانە هەڵسوکەوت بکەم، ئێمە لە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لە سەرۆك و دوو جێگر پێکهاتووین و بڕیارەکانمان بەکۆمەڵ و بە دەنگدانە، هیوادارم کە ئەوەش بزانیت من لەو پارێزەرانەم کە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا ئیمزامان لەسەر بانگەوازی کۆتاییهێنان بە حوکمی لە سێدارەدان لە جیهاندا کردووە».

لە ساڵی 1983دا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەتەنیا دانوستاندنی لەگەڵ حکومەتی عیراقدا کرد بەبێ پارتی دیموکراتی کوردستان، وەك تاڵەبانی ڕوونیدەکاتەوە، هەروەها

دەڵێت: «لە ساڵی 1991دا وەفدی کوردی هاوبەش بوو، جگە لە نوێنەرانی هەردوو حزبی پارتی دیموکرات و یەکێتیی نیشتمانی، کەسایەتی سیاسی لە حزبە کوردییەکانی دیکەی وەك حزبی شیوعی و حزبی سۆشیالیستی لە خۆگرتبوو، وەفدی یەکەم بە سەرۆکایەتی من بوو، دووەمیش بە سەرۆکایەتی برامان مەسعود بارزانی بوو».

پاش جەنگی گەردەلوولی بیابان کە تێیدا هێزەکانی هاوپەیمانیی نێودەوڵەتی بە سەرکردایەتیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کوەیتیان لە دەستی هێزەکانی عیراق ڕزگار کرد، سەدام حسێن هەستی بە لاوازی کرد، وەك نەریتی هەمیشەیی یاخود بە پشتبەستن بە فەلسەفە باوەکەی، چونکە ئەو کاتێك هەست بە لاوازی ڕژێمەکەی یان بارودۆخی ناوخۆی دەکات پەنا بۆ کورد دەبات و داوای گفتوگۆ دەکات بۆ چارەسەری کێشەی کورد، بەڵام هەر کە هەستی بە بەهێزیی کرد دانوستاندنەکان هەڵدەوەشێنێتەوە و شەڕ لەگەڵ کورد دەکات، بەم جۆرە دوا دیداری نێوان تاڵەبانی و سەدام حسێن لە ساڵی 1991دا بوو، هەروەك خۆی ڕوونیدەکاتەوە و دەڵێت: «دوا دیدرام لەگەڵ سەدام حسێن پاش ڕزگارکردنی کوەیت بوو لە ساڵی 1991دا کە من جارێك چووم بۆ بەغدا، پاشان بۆ دووەم جار چووین و بینیمان و دانوستاندنێك لە ئارادابوو تێیدا چەند کارنامە و پێشنیارێکمان پێشکەشکرد سەبارەت بە دیموکراسی و ئەنجامدانی چاکسازی لە ڕژێمدا جگە لە پێشنیارەکانمان سەبارەت بە کێشەی کورد، سەدامیش بە چوار خاڵە گرنگەکە ڕازی بوو: کە بریتیبوون لە مافەکانی مرۆڤ و جێبەجێکردنی سیستمی دیموکراسی و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و

ئاساییکردنەوەی بارودۆخ، بە هەموو ئەم خاڵانە ڕازی بوو، ڕژێم بۆ داواکارییەکانمان هاتە پێشەوە تەنانەت گەیشتینە چارەسەر بۆ کێشەی کەرکوکیش، پاشان چەند لیژنەیەکمان پێکهێنا و دکتۆر فوئاد مەعسوم لەلایەن ئێمەوە دانوستاندنەکانی بەڕێوەدەبرد، بەڵام لە دواساتدا پاشگەزبوونەوە لەوەی لەسەرەتاوە پێی ڕازی بوون»، هەروەها وتی: «هێشتا هەستیان بە تاڵاوی شکستیان لە کوەیت دەکرد کاتێك ڕازیبوون بە پێشنیارەکانمان، بەڵام لە خولی دووەمی دانوستاندنەکاندا کە خۆیان بینی بەردەوامن لەدەسەڵاتدا، پاشگەزبوونەوە».

قەدەری سەرۆك جەلال تاڵەبانی وا بوو یەکێك بێت لە شێخانی تەکیەی تاڵەبانی وەکو باب و باپیران و حوسامەدین تاڵەبانی باوکیشی، ئەگەر چی لە منداڵییەوە ڕێگای سیاسەتی گرتەبەر، چونکە توانی لە منداڵییەوە خۆی کەشتیی ژیانی بڕانێت بەرەو جیهانێکی تر. لە ساڵی 1933 لە دایکبووە، لە ماڵێکی ئایینپەروەر و لە نێو خێزانێکی ئایینپەروەردا گەورەبووە، لە نێو دیوارەکانی تەکیەی تاڵەبانیشدا لە شاری کۆیە پێگەیشتووە کە باوکی سەرپەرشتی دەکرد، وەك قوتابییەك بنەماکانی ئایینی خوێند و قورئانی پیرۆز و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر و فیقهی ئیسلامی بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی لەبەر کرد.

ئەمە لە پاڵ خوێندنی ئاسایی لە قوتابخانەی سەرەتایی یەکەمی کۆیە، دەچووە کتێبخانەکانی ئەم شارە کە ماوەی سەعات و نیوێك لە سەنتەری شاری سلێمانییەوە دوورە و وەك یەکێك لە سێ شارە بەناوبانگەکە لە زووەوە ناوی بە ڕۆشنبیری و ئەدەب و سیاسەت و گیانی شۆڕشگێڕانە دەرکردبوو، کاتێکیش

دەبووایە تاڵەبانی خۆی و ئایندەکەی یەکلایی بکاتەوە لە نێوان ئەوەی بە قوتابی بمێنێتەوە لە خوێندنگەی ئایینی تەکیە بۆ ئەوەی «شێخایەتی» ئایینی لە باوکییەوە بۆ بمێنێتەوە و درێژە بدات بە ڕێگاکەی باب و باپیرانی بەتایبەتی کە کوڕی تاقانەی خێزانەکەی بوو، بۆ ئەوەی ناوی تەکیەکە بپارێزێت، هەروەك دایکیشی دەیویست بەم ئاڕاستەیەدا بڕوات و هانیشی دەدا، یاخود هەر زوو بە ڕێگای کاری سیاسیدا بڕوات، ئەوا بەبێ دوودڵی ڕێگای دووەمی هەڵبژارد.

لەم بەشەی بیرەوەرییەکانی کە بۆ «الشرق الاوسط»ی دەگێڕێتەوە، سەرۆك تاڵەبانی دەچێتە سەرچاوەکانی یەکەمی ژیانی خۆی و دەگەڕێتەوە بۆ خێزانەکەی و ڕەگوڕیشەی، هەروەها بۆ سەرەتاکانی هۆشیاریی سیاسی کە پێچەوانەی خوێندنەکەی و ژینگە ئایینیەکەی بوو، هۆشیارییەکی مارکسی چەپڕەی هەبوو هەر لە یەکەم کتێبەوە کە خوێندوویەتییەوە.

لە ڕۆژی دواتری گەیشتنمان بۆ شاری سلێمانی، نەمانتوانی سەرۆك تاڵەبانی ببینین، چونکە یەکەم ڕۆژی لە شارەکەیدا بە سەرۆکایەتیکردنی کۆبوونەوە سیاسییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە بەسەر برد، دوای دوو ڕۆژ چووە هاوینەهەواری دوکان کە لەوێدا خانوویەکی ساکاری هەیە بەسەر دەریاچەی دوکاندا دەڕوانێت، ئەو دەریاچە سەرنجڕاکێشەی بە شینی ئاوەکەیەوە کەوتۆتە ئامێزی چیاکانی دەوروبەری و ئەو دۆڵەی کە ئەو کۆمەڵە چیایەی پێکەوە گرێداوە دروستیان کردووە عەمبارێکی سروشتی ئاوە کە بەنداوێکی لەسەر دروستکراوە بەناوی بەنداوی دوکان.

بە پێشنیاری ئەو ڕێککەوتین کە لەوێ لێی نزیک بم، ئەو دەرفەتانە بقۆزینەوە کە دروست دەبن بۆ ئەنجامدانی ئەو گفتوگۆیانەی پەیوەندییان بە مێژووی خۆی و بیرەوەرییەکانیەوە هەیە، ئەگەرچی سەرۆك تاڵەبانی ئەوەی هەڵبژارد کە لە مێژووی سیاسییەوە دەستپێبکەین، ئێمە بەباشمانزانی بڵاوکردنەوەکە یەك لەدوای یەك بێت و بە مێژووی خێزانەکەی دەستپێبکات بۆ ئەوەی سەرەداوی چنراوی ئەم بیرەوەرییانە لە خوێنەر ون نەکەین.

جەلال حوسامەدین تاڵەبانی لە خێزانێکی ئایینپەروەرە و دەڵێت: «باوکم ڕێبەری تەکیەی تاڵەبانییە لە کۆیە، تاڵەبانی بنەماڵەیە نەك عەشیرەت، بنەماڵەیەکە سەر بە عەشیرەتی (زەنگنە)یە لە کەرکوك. گەورەی ئەم بنەماڵەیە کەسێکە ناوی مەلا مەحمودی زەنگنەیە و لە گوندێك دەژیا کە ناوی تاڵەبانە و دەکەوێتە خۆرهەڵاتی چەمچەماڵەوە، مەلا زیرەك و چالاك بووە بەجۆرێك سەرۆکی عەشیرەتی زەنگنە کچەکەی خۆی داوەتێ ئیتر پێگەیەکی کۆمەڵایەتی گەورەی پەیداکردووە لە پاڵ پێگە ئایینییەکەیدا».

ئەو کاتە ڕێککەوت بوو لەگەڵ گەیشتنی یەکێك لە شێخە بەناوبانگەکانی تەریقەتی قادری (کە بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەگەڕێتەوە و مەزارەکەی لە بەری ڕەسافەی بەغدایە) بۆ گوندی تاڵەبان کە ئەویش شێخ ئەحمەدی هیندییە، تاڵەبانی دەڵێت: «کاتێك شێخ ئەحمەدی هیندی لە هیندستانەوە بە ڕێگەی ئێراندا گەیشت کە یەکێك بوو لە کەسە بەناوبانگەکان بەوپێیەی لە شوێنکەوتووانی تەریقەتی قادری بوو، لە ڕێگەیدا بۆ بەغدا بۆ سەردانی مەزاری گەیلانی، بە گوندی تاڵەباندا

تێپەڕی و بووە میوانی مەلا مەحمودی زەنگنە و مەلا و بیرۆکەکانی کەوتە بەردڵ بۆیە ناوی جێنشینی خۆی لێنا، ئیتر لەو کاتەوە مەلا مەحمودی زەنگنە بووە یەکێك لە شوێنکەوتووانی تەریقەتی قادری. پاشان مەلا زەنگنە منداڵێکی بوو ناوی نا ئەحمەد بەناوی شێخ ئەحمەدی هیندییەوە، لەبەرئەوەش کە ئەحمەد لە گوندی تاڵەبان لەدایکبوو ناوی لێنرا شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی».

نازناوەکە لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە، هەروەها سەرۆك بەردەوام دەبێت لەسەر ڕوونکردنەوە: «کاتێکیش شێخ ئەحمەد گەورە بوو و ژنی هێنا، یانزە کوڕی بوو، پاش ئەوە چووە کەرکوك و لەوێ تەکیەی تاڵەبانی دروست کرد، کاتێکیش منداڵەکانی شێخ ئەحمەد گەورە بوون، ئاینی ئیسلامیان خوێند و بڕوانامەی زانستی ئایینیان وەرگرت، پاشان دابەشبوون بەسەر ناوچەکانی کوردستانی عیراق و ئێراندا بۆ بڵاوکردنەوەی تەریقەتی قادری، هەشیانبوو ڕۆیشتن بۆ خانەقین و کفری (لەناو عیراقدا) هەشیانبوو کۆچی کرد بۆ ناوچەی سەردەشت لە ئێران ئەویش باپیرمان شێخ غەفور تاڵەبانییە کە ئێمە نەوەی ئەوین»، کاتێکیش باپیری ماوەیەکی زۆر لە ئێران مایەوە تورکەکان داوایان لە شێخی تەریقەتی قادری لە کەرکوك (شێخ عەبدولغەفور تاڵەبانی) کرد لە ئێران بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی ئێراندا نەمێنێتەوە، بۆیە ئەویش گەڕایەوە.

دیوەخانەکەی شێخ لە کەرکوك هەندێك لە ئاغاکانی حەوێزی تێدابوو، لە کۆیەش دوو بنەماڵەی ئاغای لێبوو کە ئەوانیش بنەماڵەی حەوێزی و غەفوری ـن، کاتێك ئاغاکانی حەوێزی دەچوونە کەرکوك لە تەکیەی تاڵەبانی وەك میوان دادەبەزین،

چونکە ئەو کاتە ئوتێل نەبوو کۆیەش سەر بە کەرکوک بوو، لەبەر ئەوە کاتێك یەکێك لە ئاغا حەوێزییەکان لە دیوەخانی شێخی تاڵەباندا بوو لە کەرکوك داوایلێکرد براکەی بنێرێت بۆ کۆیە تا ئاغاکان تەکیەیەکی تایبەت بەخۆی بۆ ئامادە بکەن، هەروەها سەرۆك دەڵێت: «هەرواش بوو، باپیرە گەورەم هات بۆ کۆیە و لەوێ تەکیەی تاڵەبانی دروست کرد کە تا ئەمڕۆش لە کۆیە ماوە». کە سەردانی تەکیەکەمان کرد لە کۆیە بینیمان وەك خۆیەتی، سادەیە و ژووری وانەخوێندن و میوانخانەی پێشوازیکردن و لە مزگەوتێکی بۆ نوێژکردن لە خۆگرتووە.

لەگەڵ سەرۆك تاڵەبانی بەڕێگادا دەڕۆین بەرەو سەرچاوەی یەکەمی و دەڵێت: «باوکم لە گوندی کەلکان بوو، لە ساڵی 1933 لەدایکبووم، باوکم کشتوکاڵی دەکرد، کاتێك شێخ عیزوڵڵای مامی کۆچی دواییکرد کە ڕێبەری تەکیە بوو، لەلایەن بنەماڵەکەوە هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی جێی مامی بگرێتەوە و ببێتە ڕێبەری تەکیەی تاڵەبانی لە کۆیە، ڕێگەپێدانێکی شاهانەی بۆ دەرچوو تا بچێتە ئەو شوێنە کە لەو کاتەدا کاری پێدەکرا، تائێستاش ئەم ڕێگە پێدانەمان لەلا ماوە و پاراستوومانە، بەو پێیەش باوکم لە گوندی کەلکانەوە چوو بۆ شاری کۆیە، ئەو کاتە تەمەنم چوار ساڵ بوو، بەم جۆرەش لەم شارەدا پێگەیشتم و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم تێدا تەواوکرد».

شاری کۆیە گرنگترین نیشانە بووە لە مێژوو و ئاییندەی تاڵەبانیدا، چونکە ئەم شارە تازەپێگەیشتوو و ئارامە بە سێبەری چیا و باخەکانی، هێشتا کۆڵانەکانی هەنگاوەکانی ئەو منداڵەی پاراستووە کە پڕبوو لە زیرەکی و ئامادەگی، وەك دکتۆر فوئاد مەعسوم وەسفی دەکات. ئەم شارە بە خەڵکەکەی و تەکیەکەی و خوێندنگا و کتێبخانە و چایخانەکانیەوە کەسایەتی ئەم منداڵە و ئەم کوڕەی ئاڕاستەکرد کە لە ئاییندەدا پێگەیەکی سیاسیی دیاری دەبێت. سەرۆك دەڵێت: «لە ڕاستیدا من قەرزداری ئەم شارە و خەڵکەکەیم کە پەروەردەیان کردم بەتایبەتی لەڕووی سیاسی و ڕۆشنبیرییەوە، چونکە شاری بیرۆکەی تازە و چالاکیی سیاسیی و شۆڕشگێڕانە بوو، هەروەك شاری ئەدەب و داهێنانی کوردیش بوو، بۆ نموونە لە شاعیرە بەناوبانگەکانی کورد کە سەر بەم شارەن حاجی قادری کۆیی کە یەکەم کەس بووە هۆنراوەی نیشتمانیی کوردی بە دیالێکتی سۆرانی وتووە و پەیکەرێکی هەیە لە کۆیە کە

خۆی و دەستکەوتەکانی بەبیر دێنێتەوە، هەروەها بنەماڵەی جەلیزادە لە بەناوبانگترین بنەماڵە ئایینپەروەرەکان بوون و بارەگاکەیان لە کۆیە بوو، مزگەوتەکەیان وەك زانکۆیەك وابوو خوێندکاران لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و هەرکەسێك بەدوای زانستدا بگەڕایە بۆی دەهاتن بەمەبەستی خوێندن. کۆیە مەڵبەندێکی ئەدەبی و ئایینیی ئیسلامی و سیاسی بوو، جگە لەوەش هەستی خەڵکی ئەم شارە نیشتمانپەروەرانە و شۆڕشگێڕانەیە، لە پاش جەنگی دووەمی جیهانی بیری سۆشیالیستی تێدا بڵاوبووەوە، ڕوویەکی چەپڕەوانە و مارکسی وەرگرت، من شانازی بەوەوە دەکەم کە لەم شارەدا پەروەردە بووم و خۆم بە قوتابی قوتابخانەی نیشتمانی کۆیە دەزانم».

ئەم جۆرە کەشەی تاڵەبانی تێدا پێگەیشت، بەتایبەتی ئەو کەش و هەوا ئایینیەی بنەماڵەکەی تێدابووە و ژینگە سەرەکییەکەی، دەکرا بیکەنە پیاوێکی ئایینی زیاتر لەوەی بیکەنە پیاوی سیاسەت؟

لەو بارەیەشەوە دەڵێت: «بەڵێ لەبەر ئەوە دایکم (خوا لێی خۆشبێت) هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم و پێی دەوتم: کوڕم.. دەبێت لە قوتابخانەی ئایینیدا بخوێنیت نەك لە قوتابخانە ئاساییدا، تا ببیتە مەلا و پیاوێکی ئایینی و شێخایەتی و تەکیەکە بگریتە دەست. منیش لە منداڵییەوە هەمیشە و بەبەردەوامی دەچوومە تەکیە کە لەوێ قورئانیان پێ لەبەر دەکردین و فیقهی ئیسلامییان پێدەخوێندین و هەر لە منداڵییەوە بەڕۆژوو دەبووین و نوێژمان دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دانیشتنانەی کە ئێواران و شەوانی ڕەمەزان لە تەکیە دەکران هەروەها لە شەوانی مانگەکانی دیکەدا دەکران گفتوگۆ و وتووێژیان لەبارەی جەنگی

دووەمی جیهان تێدا بەڕێوەدەچوو کە ئەو کاتە جیهانی سەرقاڵ کردبوو، لەبیرمە.. منداڵ بووم لەسەرەتای تەمەندا بووم، کاتێك هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر یەکێتیی سۆڤیێت ڕوویدا، لەوێ دادەنیشتم و گوێم لە قسەی گەورەکان دەگرت، لەوانەش شێخ فازڵ تاڵەبانی وەکیلی قایمقامی کۆیە کە خەڵکی کەرکوکە و بەڕێوەبەری ناحیەی تەقتەقیش بوو، پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو و مەیلی چەپڕەوانەی هەبوو، وتی: ئەمە سەرەتای کۆتایی ئەڵمانیایە، وەك چۆن ناپلیۆن لە مۆسکۆ تێکشکا، هیتلەریش لەوێ تێکدەشکێت. ئەم تێبینیە لە مێشکمدا مایەوە و زۆر بەباشی لەبیرمە، ئەمە نموونەیەکی ئەو گفتوگۆیانەبوو کە لە دانیشتنەکانی باوکمدا بەڕێوەدەچوون لە تەکیەی تاڵەبانی، ئەمە جگە لە وتووێژ و چیرۆك و گفتوگۆ سەبارەت بە شۆڕشی بارزان (مەلا مستەفای بارزانی)، منیش دادەنیشتم گوێم لەم گفتوگۆیانە دەگرت، لەبەر ئەوە کاریگەریی تەکیەکە لەسەرمان زۆر بوو، کاریگەرییەکە دوو سەرە بوو لە دوو ڕووەوە، ئایینی و نیشتمانیی (سیاسی) کە کاریگەریی هەبوو لەسەر هۆشیاریی پێشوەختمان و نیشتمانپەروەرییمان، هەروەك گفتوگۆ و وانە ئایینیەکان کاریگەریی زۆریان هەبوو لەسەر پەروەردە و ڕۆشنبیریمان، چونکە قورئانی پیرۆزمان دەخوێند و لەبەر دەرکرد بێگومان بە زمانی عەرەبی بوو، هەروەها وانەکان و فیقه و فەرمودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر کە بە عەرەبی لەبەرمان دەکردن و لێکدانەوەکەیان بۆ دەکرد و بۆیان وەردەگێڕاین بۆ کوردی، ئەمە ئامادەیکردم بۆ ئەوەی بـــە خێرایی و بە ئاسانی فێری عەرەبی ببم».

تەکیەی تاڵەبانی بوو کە جەلال تاڵەبانی ئامادەکرد بۆ ئەوەی زۆر بەزوویی وانەی سیاسی وەربگرێت و لەوبارەیەشەوە دەڵێت:

«له ساڵی 1945دا خوێندكار بووم له قوتابخانەی یەكەمی كۆیەی سەرەتایی، ئەو ساڵە، ساڵی جۆش و خرۆش بوو له كوردستان، چونكه له كوردستانی عیراق شۆڕشی دووەمی مەلا مستەفا بارزانی هەڵگیرسا، له كوردستانی ئێرانیش جموجوڵێكی چالاك هەبوو له مهاباد كه بووە مایەی دامەزراندنی كۆماری ناسراوی مهاباد، هەستێكی گشتی له نێو كورددا هەبوو كه گوزارشتی لەوە دەكرد دۆستان هەن پشتیوانی له گەلی كورد دەكەن، چونكه سۆڤێتیەكان له ئێراندا بوون و سوپای سووریش له بەشێكی ناوچەی كوردیدا بوون، ئەمەش مەیلی نیشتمانیی لەلای كورد زیاتر دەكرد، چونكه ئەو هەستەی بڵاوبوو له ناو كورددا، كه جگه له چیاكان كەس پشت و پەنایان نییە، بەسەرچووبوو، بەڵام ئێستا پەنایەكی دیكەیان هەیە كه ئەویش یەكێتیی سۆڤێتە، لەو قۆناغەدا من قوتابی بووم له قوتابخانەی سەرەتایی و هەموو ساڵێك به سەركەوتوویی و بەیەكەم دەردەچووم، (كاتێك چووین بۆ سەردانی یەكەم قوتابخانەی له كۆیه، بینیمان نۆژەندەكرێتەوە، چونكه قوتابخانەیەكی كۆنه و له سەردەمی عوسمانیدا دروستكراوە، كاری نۆژەنكردنەوەش بۆتە هۆی گواستنەوەی هەموو بەڵگەنامەكان بۆ شوێنێكی تر، مامۆستایەكی قوتابخانەكه پێیوتین بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانه تۆماری تاقیكردنەوەكانی خوێندكار جەلال تاڵەبانی هەڵگرتووە و نمرەكانی له پۆلی یەكەمەوە تا دەرچوونی له خوێندنی سەرەتایی بەرزترینه لەنێو قوتابیانی سەرەتایی — بەكالۆریادا)».

هەروەها سەرۆك تاڵەبانی دەڵێت: «كاتێك خوێندنی سەرەتاییم تەواوكرد له تاقیكردنەوەی گشتیدا (بەكالۆریا) پلەی یەكەمم بەسەركەوتوویی لەسەر ئاستی قوتابخانەكانی هەموو لیوا

(پارێزگا)ی سلێمانی (ڕەنگە بەهەڵە ڕوویدابێت و مەبەست پارێزگای هەولێر بێت) بەدەستهێنا».

هەروەها دەڵێت کە بەهۆی سەرکەوتوویییەکەیەوە «مامۆستاکان ڕایاندەسپاردم بۆ خوێندنەوەی هۆنراوە لەمیانی ڕیزبوونی بەیانیاندا پێش دەستپێکردنی خوێندن لە قوتابخانەدا، منیش بەردەوام هۆنراوەی نیشتمانیم هەڵدەبژارد، چونکە مامۆستامان هەبوو هەستی نیشتمانپەروەییان تێدابوو و هۆنراوەی نیشتمانپەروەرییان پێدەوتین و فێردەکردین، لەوێوە هەستی نیشتمانپەروەریی لە ناخمدا دەستیکرد بە گەشەکردن و لە مێشکمدا چەسپا، لە پاڵ ئەوەی باسمکرد لە ڕابوونی کورد بۆ شۆڕشی بارزان و کۆماری مهاباد، هەست و سۆزم نیشتمانپەروەریی چەپڕەوانەبوو، چونکە ئەو کاتە لەلایەن یەکێتیی سۆڤێتەوە پشتیوانی دەکراین و شەپۆلی چەپڕەوی باڵادەست بوو لە ناوچەکەدا، بەم جۆرە لەنێو خوێندکاراندا کارم دەکرد بە پشتیوانی یەکێك لە مامۆستا نیشتمانپەروەرەکانمان کە ئەویش سوپاس بۆ خوا تا ئەمرۆ لە ژیاندا ماوە و ناوی کەمال عەبدولقادر نەشئەتە، مامۆستای وەرزش بوو ڕایسپاردم بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی یاری پینگ پۆنگ (تێنسی سەرمێز) بگرمە ئەستۆ، بەم بۆنەیەشەوە لەگەڵ هاوڕێ خوێندکارەکانمدا لەگەڵیدا کۆدەبووینەوە بۆ ئەوەی باسی هەستی نیشتمانپەروەریی کوردمان بۆ بکات، هەر ئەویش بوو کە پاڵی پێوەناین و هانیداین بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی کوردی نهێنی بۆ خوێندکاران کە ناوی (کۆمەڵەی پێشکەوتنی خوێندەواری) بوو، بەکردەوەش لە ساڵی 1946دا ئەم کۆمەڵە نهێنییەمان پێکهێنا و ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکاران تێیدا بوونە ئەندام بەتایبەتی خوێندکارانی پۆلی شەشەم، لەڕێی ئەم کۆمەڵەیەوە بەشێوەیەك لە شێوەکان تێکەڵاوی

کاری ڕێکخستنی سیاسی بووم، لە ئاهەنگە گشتییەکاندا لە شاری کۆیە و لە جەژنەکانی نەورۆزدا شیعرم پێشکەش دەکرد».

لێرەدا دکتۆر فوئاد مەعسوم ڕوونیدەکاتەوە و دەڵێت: «لەو کاتەوەی کە جەلال تاڵەبانی قوتابی بوو لە قوتابخانەی سەرەتایی نازناوی مام جەلال-ی هەڵگرتووە، چونکە وشەی مام مانای مام نییە بە سیغەی تەمەن، بەڵکو مانای دانا دەگەیەنێت بەشێوەکی تر، چونکە مام پێویستە دانا و زیرەك بێت، هەروەها ئەو سەرۆکایەتیی وەفدە خوێندکارییەکانی دەکرد لە بۆنە سیاسی و کۆمەلایەتییەکاندا».

سەرۆك تاڵەبانی لە درێژەی قسەکانیدا وتی: «لەبەر ئەوەی بوومە سکرتێری کۆمەڵەی پێشکەوتنی خوێندەواری بۆیە لە پێشەوەی خوێندکاران بووم بۆ ئامادەبوونی ئاهەنگە نیشتمانییەکان یاخود کۆمەلایەتییەکان وەك شایی و پرسە، بوونی ئێمە بووە دیاردەیەکی ناسراو لە کۆیە»، ئەو کاتە تەمەنی لە 13 ساڵ کەمتر بوو کە سەرۆکایەتی کۆمەڵەیەکی خوێندکاری سیاسیی دەکرد.

بەرلەوەی تاڵەبانی لەڕووی ڕێکخستنەوە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردی عیراق بێت کە ئەو کاتە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان وابوو، ئەوا بە هەر شێوەیەك بێت چووە ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی عیراق هەروەك خۆی ڕوونیدەکاتەوە: «لە هاوینی 1946دا لە کۆڕێکی ڕۆشنبیریدا بووم کە سەر بەحزبی شیوعی عیراق بوو، فاتح ڕەسوڵ بردمی بۆ ئەو کۆڕە کە لە ئێمە بەتەمەنتر بوو، لە خوێندنی ناوەندی بوو، هەڵسوڕاو بوو، لەگەڵ هەندێك خوێندکاری تردا لە کۆڕێکی ڕۆشنبیریدا گوێکردمەوە کە هەفتانە بۆی ڕێکدەخستین، بەڕەسمی سەر بە حزبی شیوعی نەبوو، بەلام بەوە ناسرابوو کە لە کۆڕەکانی حزبی شیوعی عیراقە.

ئەو کاتە لە کۆیە دوو کتێبخانەی لێبوو، یەکەمیان (کتێبخانەی کۆیە) کە سەر بە حزبی شیوعی عیراق بوو، هەروەها کتێبخانەی (حاجی قادری کۆیی) کە سەر بە پارتی دیموکراتی کورد بوو، بەگوێرەی ڕێنماییەکانی کۆڕە ڕۆشنبیرییەکەمان و ڕەسوڵیش ئەوا ناوی خۆمان لە کتێبخانەی کۆیە تۆمارکرد بۆ خواستنەوەی کتێب، ئەو کاتە عەرەبیم نەدەزانی، بەڵام یەکەم کتێبم لەیادە کە ڕایانسپاردین بخوێنینەوە ئەویش (یەکێتیی سۆڤێتی هاوپەیمانمان) بوو کە بە زمانی عەرەبی بوو. بێگومان ئەندامێتیم لەم کۆڕە ڕۆشنبیرییەدا تا هاوینی 1946 بەردەوامبوو کە ناکۆکیمان تێکەوت سەبارەت بە مەسەلەیەك پەیوەندی بە کوردەوە هەبوو هەروەها لە میانی گفتوگۆمان سەبارەت بەوەی کورد گەل و نەتەوەیە یان نا، تووشی سەرسامی بووم کە بینیم بەرپرس و ئەندامانی کۆڕەکە ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە کورد نەتەوە یاخود گەل بێت بەگوێرەی بیرۆکە شیوعیەکانیان لەو کاتەدا، بەم پێیەش ئەوە مانای وایە کە کورد مافی چارەی خۆنووسینی نییە، بەڵام من سووربووم لەسەر ئەوەی کورد گەل و نەتەوەیە، ئەگەرچی دابەشبووە، بەڵام یەك گەلە، تەنانەت ئەگەر هەموو مەرجەکانی ستالین بۆ نەتەوەشی تێدا نەبێت، ئەوا کورد گەلە و کێشەیەك و خەباتی نەتەوەیی بەردەوامی هەیە و بەڵگەش بۆ ئەوە دامەزراندنی کۆماری مەهابادە و سۆڤێتییەکانیش پشتیوانی مەهابادیان کردووە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە پیرۆزباییەکی سۆشیالیستی هەیە بۆ جووڵانەوەی کورد، لە ئەنجامی ئەوەشدا ناکۆك بووم لەگەڵ ئەم کۆڕە و بیرۆکەکانیان و وازم لێهێنان».

ئەو ڕووداوە بوو وای لە تاڵەبانی کرد لەڕووی فیکرییەوە بۆچوونەکانی پارتی دیموکراتی کورد وەربگرێت کە ئەو کاتە تازە

دامەزرابوو، وەك خۆی دووپاتیدەكاتەوە: «پەیوەندیم لەڕووی فیكرییەوە بە پارتی دیموكراتی كوردی عیراقەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1946» هەروەها بەردەوام دەبێت و ڕوونیدەكاتەوە: «لە كۆیە چایخانەیەكی لێبوو كە ڕووناكبیران بەتایبەتی ئەو خوێندكارانەی زانكۆ لێی دادەنیشتن كە لە بەغدا دەیانخوێند لەكاتی گەڕانەوەیان بۆ لای خێزانەكانیان لە هاویندا، منیش حەزمدەكرد لەو چایخانەیە دابنیشم، ڕۆژێك عومەر مستەفا بانگی كردم كە بە عومەر دەبابە ناسراوە، ئەو كاتە لە بەغدا دەیخوێند و گەڕابووەوە بۆلای كەسوكاری، پێی وتم تۆ قوتابییەكی زیرەك و ژیریت، نابێت بەدوای پڕوپاگەندەی سیاسیدا پەلكێش بیت (مەبەستی كۆڕەكەی حزبی شیوعی بوو)، پاشان باسی پارتی دیموكراتی كوردی عیراقی بۆ كردم كە ئەو كاتە تازە دامەزرابوو، باسی ئەوەی بۆ كردم كە حزبەكە لەلایەن مەلا مستەفای بارزانییەوە دامەزراوە و یەكێتیی سۆڤێتیش پشتیوانی ئەم حزبە دەكات، پاشان بەیاننامەی دامەزراندنی پارتی دیموكراتی كوردی عیراقی بە ئیمزای مەلا مستەفا پێدام كە بەزمانی عەرەبی بوو، ئیتر لەو كاتەوە بە ڕۆح و فیكر وابەستەی پارتی دیموكراتی كورد بووم، هەروەها ئاموژگاریكردم كە ناوی خۆم لە كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی تۆمار بكەم، هەرواش بوو، چووم و بوومە هاوبەش لەم كتێبخانەیەدا و لە كتێبخانەی كۆیە كشامەوە».

لێره هەمووان بەناوی مام جەلال قسە لەگەڵ سەرۆکی عیراق دەکەن، تەنانەت کاتێك باسیشی دەکەن، چونکە ئەو لەنێو کورددا ڕەمزی جەماوەری و سیاسییانە، ئەم ڕەمزەش بەلای ئەوانەوە لە بەڕێز سەرۆك کۆمار بەرزترە، پێشمەرگەیەکی دێرین لە وەڵامی ئەو پرسیارەمدا «بۆچی بە بەڕێز سەرۆك بانگی ناکەن؟».

دەڵێت: «هەر عیراقییەك دەتوانێت ببێتە سەرۆك کۆمار، ئەگەر هەلومەرجی بۆ بڕەخسێت و ئەگەر حزبەکان لەنێو خۆیاندا ڕێکبکەون، بەڵام هیچ عیراقییەك چ عەرەب بێت یان کورد ناتوانێت ببێتە مام جەلال، ئێمە لە شاخ بەم ناوەوە ناسیومانە و هەرواش دەیناسین، ئەگەر لەگەڵ ژنەکەم لە ماڵەوە وەك سەرۆك کۆمار باسی بکەم، ئەوا ژنەکەم کە لە گوندێکی دامێنی چیا لەگەڵم دەژی، نازانێت باسی کێ دەکەم، بەڵام بۆ نموونە کاتێك دەڵێم لەگەڵ مام جەلال بووین، دەستبەجێ دەزانێت مەبەستم کێیە».

بەلای منەوە هەر کە سەرۆك تاڵەبانیم بە بەڕێز سەرۆك بانگدەکرد وەڵامی دەدایەوە «بەڵێ فەرموو مامۆستا»، کاتێکیش بەهێمنی داوام لێکرد بە نازناوی مامۆستا بانگم نەکات، بەڵکو وەك کەسانی تر بە وشەی براکەم بانگم بکات، دەستبەجێ وەڵامی دایەوە «ئەگەر بەناوی مام جەلالەوە بانگم بکەیت، ئەوا بە وشەی براکەم وەڵامت دەدەمەوە، من حەزناکەم بە بەڕێز سەرۆك بناسرێم، بەڵکو حەز دەکەم بە مام جەلال بناسرێم». مەوعیدم لەگەڵیدا سەعات نۆی بەیانی بوو، پێش کاتەکە بە بیست دەقیقە گەیشتمە ماڵەکەی لە هاوینەهەواری دوکان، لەگەڵ ماکۆك شێخ محەمەدی سکرتێری ڕۆژنامەنووسیی لە نهۆمی خوارەوە دانیشتبووم، لێمپرسی ئایا سەرۆك مەوعیدەکەی لەبیرماوە، بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە کە مام جەلال هەرگیز هیچ

مەوعیدێکی لەبیرناچێت، هەر کە بوو بە سەعات نۆ گوێم لە دەنگی بوو لە نهۆمی سەرەوە پرسیاری لەبارەی منەوە دەکرد.

مام جەلال لە هەموو شتێکدا وردە و زۆر ڕێکخراوە، ڕەنگە یەکێك لە خاڵەکانی پێشکەوتنی لە حزبدا، ڕێکخراوییە وردەکەی بێت. لەم بەشەدا سەرۆك تاڵەبانی بوونە ئەندامی لە پارتی دیموکراتی کورد بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی دەگێڕێتەوە.

بوونە ئەندامی لە ڕێکخستنەکانی حزبە کوردییە تازەکەدا کە یەکەم حزبی سیاسی کوردی بوو لە عیراقدا، لەسەر دەستی یەکێك لە مامۆستاکانی بوو «مامۆستایەکمان کە ناوی تاهیر سەعید بوو، چاودێری چالاکییەکانی کردبووین، ئەوە بوو دەستنیشانی کردم لەگەڵ هاوڕێم وریا کامەرانی بۆ ئەندامێتی حزب، بانگی دەکردین بۆ ماڵەکەی خۆی تا بیروڕای حزب و ڕۆشنبیرییەکەیمان بۆ بخوێنێتەوە، داواشی لێکردین کە داواکاری بنووسین بۆ بوونە ئەندام لە پارتی دیموکراتی کوردی عیراق، بەکردەوەش داواکاریمان نووسی و لە 1947دا قبوڵکراین، بچووکترین ئەندامبووین لە تەمەندا کە تەمەنمان 13 و 14 ساڵ بوو».

کۆڕی خوێندکاریی حزب لە کۆیە گەورە نەبوو، بەڵکو تەنیا سێ خوێندکاری لەخۆدەگرت، یەکێکیان تاڵەبانی بوو کە لە ساڵی 1947دا بووە ئەندامی ڕەسمی لە حزبدا، واتە تەمەنی 13 ساڵ بوو، بەوەش بچووکترین ئەندام بوو لە تەمەندا، ئەمە لەکاتێکیشدا بوو کە بیروبۆچوونی حزبە تازەکە باڵادەستی خۆی بەسەر شەقامی کۆیەدا دەسەپاند، بەپێچەوانەی شارەکانی ترەوە کە باڵادەستی تێیاندا بۆ حزبی شیوعی عیراق بوو، هەر زووش پارتی دیموکراتی کورد بە بیروبۆچوونە نەتەوەیی و

«پێشکەوتنخواز»ەکانی ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیر و خوێندکار و کاسبکارانی بۆخۆی ڕاکێشا و ڕێکخستنەکانی لە حزبی شیوعی بەهێزتربوون.

سەرکردایەتی لە کەسایەتی مام جەلالدا بەهرەیە، هەرکەس ناسیبێتی دان بەوەدا دەنێت، ئەم بەهرەیە کە لە منداڵییەوە دەرکەوت، ئامادەیکرد بۆ ئەوەی هەر لە ڕۆژانی سەرەتای بوونە ئەندامییەوە ببێتە هەڵسوڕاوێك لە حزبەکەیدا، تاڵەبانی دەڵێت: «لە 1947دا کاتێك بوومە ئەندام لە حزبدا، چالاکییەکانم بە ڕاکێشانی خوێندکاران و گەنجانی دیکە بۆ نێو ڕیزەکانی حزب دەستپێکرد، لە ساڵی 1948یشدا چوومە خوێندنی ناوەندی لە ناوەندیی کۆیە، لەوکاتەدا بوومە لێپرسراوی قوتابیان لە پارتی دیموکراتی کورد لە ناوچەی کۆیە. ڕێکخستن نهێنی بوو، هەروەها ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعیش نهێنی بوون، دەزگای ئەمنییش هەبوون چاودێری چالاکییە نهێنییەکانیان دەکرد، لە کۆیە بە دەزگای ئەمنییان دەوت لێکۆڵینەوەی جینائی، یەك فەرمانبەری تێدابوو کە چاودێری ئەم چالاکییانەی دەکرد، بەهۆی هەستی نەتەوایەتی و هاوسۆزی خەڵك لەگەڵمان، کاریگەریی ئەم دەزگا ئەمنییە یاخود ئەو فەرمانبەرە زۆر لاوازبوو، هەتا ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی 1948 ڕوویدا و دادگای عورفی دامەزرا کە دەستیانکرد بە دەستگیرکردنی سیاسییەکان».

لێرەدا عەقڵیەتی ئازادیخوازانەی بنەماڵەی تاڵەبانی و باوکی دەردەکەوێت کە شێخی تەریقەتی قادری بوو لە تەکیەی تاڵەبانی، بەرهەڵستی چالاکییە سیاسییەکانی کوڕەکەی نەکرد، ئەویش لەبەرئەوەی گوتاری کوردی لەسەر بنەمای نەتەوەیی بنیاتنرابوو نەك لەسەر بنەمای تایفی یاخود مەزهەبی، ئەم گوتارەش لەگەڵ

ئایینی ئیسلام دژ بەیەك نەبوون، زۆربەی سەرکردە یەکەمەکانی شۆڕشی کوردیش یان لە پیاوانی ئایینی بوون یاخود لە بنەماڵەی ئایینپەروەر بوون لە پێشیانەوە سەرکردەی کورد مەلا مستەفای بارزانی و شێخ مەحمودی حەفید و مەسعود بارزانی کە لە بنەڕەتدا لە سایەی شێخایەتیدا یان لەسەر دەستی مەلادا پێگەیشتووە.

کاتێك تاڵەبانی گەیشتە تەمەنی پانزە ساڵی، بەڕێبەرایەتیکردنی خۆپیشاندانێك نێوەندەکانی کۆیەی سەرسامکرد کە بە خوێندکاران دەستیپێکرد و پاشان بووە خۆپیشاندانێکی جەماوەریی بۆ پشتیوانی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی 1948 کە وەك ڕاپەڕینێکی میللی لەدژی ئیستیعماری بەریتانی لە بەغدا هەڵگیرسا، پاشان پزیسکی ئەم ڕاپەڕینە لە هەموو ناوچەکانی عیراقدا بڵاوبووەوە، تاڵەبانی دەڵێت: «لە مانگی یەنایەر (کانوونی دووەم)ی 1948دا لە پۆلی یەکەمی ناوەندی بووم کە ڕاپەڕینی کانوونی دووەم لە بەغدا ڕوویدا، پارتی دیموکراتی کوردیش بەشدارییەکی کاریگەری لەم ڕاپەڕینەدا کرد، عومەر دەبابە لەپێشەوەی خۆپیشاندەراندا بوو، برینداریش بوو لە ئەنجامی ئەوەی تەقەیان لێکرد، هەروەها ساڵح ڕوشدی ئەندامی حزبیشی تێدابوو کە وتاری لە خۆپیشاندانەکەدا پێشکەش دەکرد، ئێمەش لە کۆیە هاتینە دەرەوە بۆ خۆپیشاندان وەك پشتیوانییەك بۆ ئەو خۆپیشاندانەی بەغدا و بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداریمان کرد لەم خۆپیشاندانەدا، کۆیە ئەوکاتە لە شارە ناسراوەکان بوو بە شۆڕشگێڕییەکەی و هەستە سیاسییەکەی، دەیانوت سێ شار هەن ئەوانیش کۆیە و زاخۆ و نەجەفن کە بە بەرهەڵستی توندیان بۆ حوکم ناسراون و لەڕووی ڕۆشنبیری و داهێنان و سیاسەتیشەوە چالاکن».

لەو ساڵەدا 1948 لەسەر ڕووی ڕووداوە سیاسییەکانی عێراق بیرۆکەی دامەزراندنی یەکێتیی گشتیی قوتابیان لە عێراق سەریهەڵدا کە یەکەم یەکێتی خوێندکاریی سیاسی عێراقە، لەبەرئەوە لە خوێندنگا ناوەندی و دوا ناوەندییەکان و پەیمانگا و زانکۆکاندا هەڵبژاردن کرا بۆ کاندیدکردنی ئەوانەی بەشدارییان لە کۆنفرانسی دامەزراندنی یەکێتییەکەدا دەکرد کە لە بەغدا دەبەسترا، شتێکی سەیریش نەبوو کە مام جەلال بە نوێنەرایەتیی خوێندکارانی کۆیە هەڵبژێردرا بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسەکەدا.

تاڵەبانی سەرقاڵی ئامادەکاریی سیاسی بوو بە مەبەستی سەردانی بۆ بەغدای پایتەخت، کە گەورەترین شاری عێراق و ئاڵۆزترینیان بوو، پێشتریش سەردانی بەغدای کردبوو بە مەبەستی چارەسەرکردنی چاوی، بەڵام ئەم سەردانە مۆرکێکی تەواو جیاواز و مەودایەکی سیاسی هەیە، چونکە ئەو بە نوێنەرایەتی خوێندکارانی شارەکەی دەچێت و بەشداری لە کۆنفرانسێکی مێژووییدا دەکات کە لە یادەوەری ڕووداوە سیاسییەکانی عێراقدا بۆ ساڵانێکی دوورودرێژی داهاتوو دەمێنێتەوە. ئایا مام جەلال بیری لەوە کردۆتەوە کە لەنێو ئەو ئاپۆرەیەی داهاتووی خوێندکاران کە لە هەموو ناوچەکانی عێراقەوە دێن، خۆی لە کوێدا دەبینێتەوە؟ بەغداش پڕە لە حزبی سیاسی و بیروڕا و ناو و کەسایەتی و دەنگی دیکە؟ بەڵام ئەم پرسیارانە بە مێشکی بچووکترین سیاسەتمەداری کوردی عێراقدا نەهاتن کە بەشداری لەم کۆنفرانسە مێژووییەدا دەکرد، بەڵکو بیروڕاکان و جانتاکەی ئامادەکرد و جلوبەرگی کوردی لەبەرکرد و پڕچەك بوو بە متمانە هەمیشەییەکەی و لەگەڵ ئەندامانی وەفدە

سیاسییە بەشداربووەکەی کۆنفرانسەکە بەرەو بەغدا کەوتەڕێ. تاڵەبانی دەڵێت: «چووم بۆ بەغدا و ئەمە یەکەم جاربوو بۆ چالاکییەکی سیاسیی دەچووم بۆ پایتەخت، چونکە پێشتر سەردانیم کردبوو لەبەر هۆکاری تەندروستی و سەردانی پزیشکان بۆ چارەسەرکردنی چاوم، لە کۆیەوە ئۆتۆمبیلێکمان گرت هەتا کەرکوك، لەوێشەوە سواری شەمەندۆفێر بووین بۆ بەغدا، لەڕێگادا بیرم لەوە دەکردەوە کە کۆنفرانسەکە چۆن دەبێت؟ دەبێت چی بکەین؟». هەروەها وتی: «لەم کۆنفرانسەدا جەماوەرێکی گەورەی خوێندکاران بەشدارییان کرد کە حزبەکەمان ئامادەبوونێکی کاریگەری تێدا هەبوو».

عیراقییەکان هاوسۆزبوون لەگەڵ کۆنفرانسەکەدا، بۆیە لە کۆنفرانسێکی خوێندکارییەوە گۆڕا بۆ جەماوەری و بەبۆنەی دامەزراندنی یەکێتیی گشتیی قوتابییان لە عیراق، لەوکاتەدا لە یەکێك لە دیارترین گۆڕەپانەکانی بەغدا ئاهەنگیان گێڕا کە ناوی (ساحة السباع) بوو تەنانەت ناوی کۆنفرانسی (السباع) لە کۆنفرانسەکە نرا و دواتریش بەوناوەوە ناسرا بەتایبەتی لە ئەدەبیاتی حزبی شیوعیی عیراقدا، کە لەپشت دامەزراندنی یەکێتییەکەوە بوو، هەروەها بەناوی ئەو گۆڕەپانەوە بوو کە دەکەوێتە ناوچەی فەزڵ لە بەری ڕەسافەی بەغدا و نافورەیەك لە ناوەڕاستیدایە کە لەسەر پەیکەری چوار شێر دانراوە. مام جەلال دێتەوە یادی و دەڵێت: «بەشداربووانی کۆنفرانسەکە ئاهەنگیان گێڕا و بۆنەکە بووە ئاهەنگێکی میللی گەورە کە کۆمەڵێکی زۆر لە عیراقییەکان بەشدارییان تێدا کرد، لەبیرمە کە شاعیری گەورە محەمەد مەهدی جەواهیری لەو ئاهەنگەدا هۆنراوەیەکی پێشکەش کرد بەناوی «یوم الشهید» کە تێیدا دەڵێت:

«★ يوم الشهيد: تحية وسلام
بك والنضال تؤرخ الأعوام
★ بك والذي ضم الثرى من طيبهم
علم الحساب، وتفخر الأرقام
★ بك والضحايا الغر يزهو شامخا
تتعطر الارضون والأيام
★ بك يبعث «الجيل» المحتم بعثه
وبك «القيامة» للطغاة تقام
★ وبك العتاة سيحشرون، وجـوههم
سود، وحشو أنوفهم إرغام»

تاڵەبانی ئامادەبوو هەتا کۆتایی هۆنراوەکە بڵێت و شوێنی دەرچوونی پیتەکانیشی زۆر بەوردی دەزانی، وەك لەبارەشیەوە زانراوە زۆربەی هۆنراوەکانی جەواهیری لەبەرە، بگرە دیوانە شیعرەکانی جەواهیری لە کتێبخانەکانی نابڕێن، کاتێکیش شاعیری گەورەی عەرەب هۆنراوەکەی دەوت، تاڵەبانی لە نزیکیەوە وەستابوو، لەو بارەیەشەوە تاڵەبانی دەڵێت: «ئەوە یەکەم جار بوو کە ڕووبەڕوو چاوم بە جەواهیری دەکەوت، من سەرسامبووم بەم شاعیرە گەورەیە، زۆرێك لە شیعرەکانیم لەبەرکردبوو بەبێ ئەوەی ماناکانی بزانم، چونکە ئەو کاتە زمانی عەرەبییەکەم لاوازبوو، لەبەرئەوەی یەك وانەی زمانی عەرەبیمان دەخوێند لە قوتابخانەی سەرەتایی، بەڵام من پەرۆشبووم و تێدەکۆشام بۆ فێربوونی عەرەبی، کە لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم هاوبەشیم کرد لە وەرگرتنی ڕۆژنامەی «الاهالی»دا کە لە بەغدا دەردەچوو بە زمانی عەرەبی، ڕۆژنامەکەم دەخوێندەوە بەبێئەوەی هەمووی تێبگەم، شیعرەکانی جەواهیری و ڕۆژنامەی «الاهالی» یارمەتیاندام لە فێربوونی عەرەبیدا».

بەستنی ئەم کۆنفرانسە و بەشداریکردنی تاڵەبانی بۆنەیەك بوو بۆ ئەوەی چاوی بکەوێت بە ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارانی عەرەب و تورکمان کە لە هەموو شوێنێکەوە هاتبوون، هەروەها وتی: «ئێمە کوتلەی پارتی دیموکراتی کوردمان پێکهێنا یان بڵێین (پارتی) وەك لەئاستی میللیدا پێیدەوترێت، دوو کەس لە حزبەکەمان وەك ئەندامی کۆمیتەی بەڕێوەبردنی یەکێتیی قوتابیان هەڵبژێردران، لەکاتێکدا من بە ئەندامی یەدەگ هەڵبژێردرام و ئەو کاتە تەمەنم (15) ساڵ بوو».

کاریگەریی بەشداریکردنی مام جەلال زۆر گەورە بوو، چونکە ئەمە یەکەم جاربوو پەیوەندی لەگەڵ عیراقییەکانی تر لە نەتەوە و حزبەکانی دیکە پەیدادەکرد، بەتایبەتی عەرەبەکان، هەروەها بۆنەیەکیش بوو بۆ ئەوەی دروشمەکانی خەباتی نیشتمانیی ببنە کارێکی بەرجەستەکراو، وەك خۆی ڕوونیدەکاتەوە «بەشداریکردنم لە کۆبوونەوەکانی یەکێتیی گشتیی قوتابیان لە عیراق، بۆنەیەك بوو بۆ گەشەکردنی بیرۆکەی برایەتیی عەرەب و کورد و خەباتی هاوبەش لە ناخمدا، خودی ئەم بۆنەیە ئەوەی بۆ دووپاتکردینەوە کە بەدوایدا دەگەڕاین و لە گفتوگۆکانماندا باسمان دەکرد لە ناو حزبدا دەربارەی ئەگەری جێبەجێبوونی بیرۆکەی خەباتی هاوبەشی عەرەب و کورد لەدژی ئیستیعماری بەریتانی و سیستمی پاشایەتی، دەتوانم بڵێم ئەم بۆنەیە بۆ من خاڵێکی وەرچەرخانی فیکریی گرنگ بوو لە ژیانمدا بۆ گۆڕان لە پێگەی خەباتی کوردی ڕووتەوە بۆ خەباتی عیراقی هاوبەش، لە دەوروبەرێکەوە بردمیە دەوروبەرێکی تری فراوانتر و قووڵتر، من باوەڕم بەم بیرۆکانە هەبوو، بەڵام کاتێك چوومە بەغدا ئاڕاستەکەرمان بەو ئاقارەدا عومەر دەبابە بوو، ئەم بابەتەش دروشمی قۆناغەکە بوو، بگرە دروشمێکی ستراتیجیش بوو بۆ ڕاپەڕینی کانوونی دووەم، لە بیرمە کە یەکێك لەو دروشمانەی بەرزکرابوونەوە بریتی بوو لە: لەسەر بەردی خەباتی هاوبەشی عەرەب و کورد، ئیستیعمار و پرۆژەکانی تێکدەشکێن، هەروەك دەرفەتی بۆ ڕەخساندین، یاخود دەرفەتی بۆ ڕەخساندم ئەو برا عەرەبانە ببینم کە بەشداری کۆنفرانسەکە بوون و لە نزیکەوە بیانناسم و بەشێوەیەکی

ڕاستەوخۆ شارەزای بیروبۆچوونەکانیان بم، لەبەر ئەوە بیرۆکەی پێکەوەیی و خەباتی هاوبەشمان لەلا دروست بوو».

تاڵەبانی لە کارەکەیدا یاخود لە جموجوڵەکانیدا سنوورێك دانانێت تێیدا بووەستێت، هەروەك سنووری کەسانی دیکەش نابەزێنێت، لەبەرئەوە دەستکەوتێکی گەورەترە بۆ منداڵێکی تەمەن پانزە ساڵان کە لە شارێکی دوورەوە بێت بۆ پایتەختی عیراق، شارێك کە هێندەی نەماوە لە نێوەندە کوردییەکەیدا دابڕاوبێت و لە نێو سەدان خوێندکاری عیراقی بەشداربووی یەکەم کۆنفرانسی دامەزراندنی یەکێتیی گشتیی قوتابیاندا کە کۆنفرانسێکی سیاسییە، وەك ئەندامی یەدەگی دەستەی بەڕێوەبردن هەڵبژێردرێت، بەوەش ئەو تەنیا بچووکترین بەشداربووی کۆنفرانسەکە نەبوو، بەڵکو بچووکترین ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنیش بوو، ئەگەرچی ئەندامێکی یەدەگی گەورەترین و گرنگترین و یەکەم یەکێتیی قوتابییانی عیراقیش بوو. جگەلەمەش ئەم منداڵە کە نازناوی «مام» جەلالی هەڵگرتووە چاوی کەوت بە کەسایەتییە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان، کە یەکەمیان جەواهیری بوو کە دواتر دەبێتە یەکێك لە نزیکترین هاورێکانی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بیری لە بینینی نەکردبووەوە، بەڵام ئەو هەموو ئەو کارانە بە هاوسەنگییەکی حساب بۆ کراو و کەسێتییەکی باوەڕبەخۆبوو لە هەنگاوەکانیدا ئەنجام دەدا، تەنانەت دەڵێت: «سەردانم بۆ بەغدا سەردانی کارێکی سیاسی بوو، ڕۆژ و شەو کۆنفرانس و کۆبوونەوە و گفتوگۆی دوورودرێژ سەبارەت بە زۆر مەسەلە، تەنانەت ئەو سەردانەشمان کە لە دەرەوەی بەرنامەی کۆنفرانسدا بوو ئەویش سیاسی بوو، بۆ نموونە بردیانین بۆ

سەردانی ڕۆژنامەی «الوطن» کە عەزیز شەریف دەریدەکرد، ئەمەش بۆنەیەکی گرنگ بوو بۆ ئێمە، چونکە یەکەمجار بوو سەردانی ڕۆژنامەیەکی عیراقیمان دەکرد لە بەغدا بەو پێیەی ئێمە وەفدی قوتابییانی کورد بووین، مامۆستا شەریف پێشوازیی لێکردین لە کاتێکدا ئێمە منداڵ بووین یان بەلانی کەمەوە من منداڵ بووم، ئەو کاتە تەمەنم 15 ساڵ بوو، پێشتریش وەك باسمکرد بۆ یەکەم جار چاومان بە شاعیری گەورە جەواهیری کەوت، پاشان چاومان بە سیاسەتمەدارە عیراقییە گەورەکان کەوت وەکو سیاسەتمەداری ناسراو کامل چادرچی لە ڕۆژنامەکەیدا «الاهالی»، هەروەها وتی: «ئەم کەشوهەوا تازەیە کە لە بەغدادا تێیدا ژیام بێگومان لە سەردانی یەکەمم بۆ پایتەخت جیاوازتر بوو، کە بەمەبەستی چارەسەرکردنی چاوم و سەردانی پزیشکەکانی چاو بوو، هەروەها لە کەشوهەوای شارێکی بچووکی وەك کۆیەوە گواستمیەوە بۆ کەشوهەوای شارێکی گەورە کە بەغدایە و کۆمەڵگەی بەغداییم ناسی، بۆ نموونە من ئەوسا و ئێستاش حەزم لە کتێب بوو بۆیە سەردانی شەقامی موتەنەبیم کرد و چوومە کتێبخانە گەورە و دێرینەکانیەوە، لەبەرئەوە وێنەی بەغدا وەك مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و شارستانی و سیاسی لە مێشکمدا چەسپا، ماوەی زیاتر لەدوو هەفتە لەوێ مامەوە، هەفتەیەکیانم بە کاری سیاسیەوە بەسەر برد و ڕۆژەکانی دیکەشم بە گەڕان بە ناو بەغدا بەسەربرد، کە سەردانی کازمیە و ئەعزەمیە و بارەگای حزبە سیاسییەکانمان کرد لە ناوچەکانیاندا، لە میانی کۆبوونەوەکاندا جلوبەرگی کوردیم لەبەردەکرد، لە کاتێکدا لە گەشتەکانمدا جلوبەرگی ئاساییم

لەبەردەکرد کە پێماندەوت (ئەفەندی)، قاتێکی ئاسایی بوو، چونکە لە قوتابخانەکانماندا جلوبەرگی کوردیمان لەبەردەکرد، من و کەمێك لە هاوڕێیانم لە کۆیە جار جار قاتی ئاسایی (ئەفەندی)مان لەبەردەکرد، لەبەرئەوە شتێکی ئاسایی بوو کە لە بەغدا جلوبەرگی کوردی لەبەربکەم، بەغداییەکان ئەم جلوبەرگە دەناسن و پێیڕاهاتوون، چونکە ژمارەیەکی زۆر کورد لە پایتەخت بوون، خەڵکی بەغداش بە ڕووخۆشی و گەرموگوڕی و خۆشەویستیەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردین، لە کۆنفرانسەکەشدا لەلایەن دانیشتووانی شارەکانی دیکەوە هەموو پێشوازییەکمان لێکرا، ڕێژەی شیوعییەکان لە کۆنفراسەکەدا بەرز بوو هەروەها نێردراوی حزبی گەل و حزبی نیشتمانی دیموکراتی و پارتی (پارتی دیموکراتی کورد) و ئەندامانی حزبە سیاسییە جیاجیاکانی لێبوو، ئەندامانی حزبەکانی دیکەش مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵ کردین، بەخێرهاتنیان دەکردین و پێش خۆیان دەخستین و بایەخیان بە کاروبارەکانمان دەدا، ئەمەش مەسەلەی برایەتی عەرەب و کورد و بیرۆکەی خەباتی هاوبەشی چڕترکردەوە».

لە کوردستانی عیراقدا جگە لە هەردوو حزبی شیوعی عیراق و پارتی دیموکراتی کورد، هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی دیکە نەبوو، لەبەرئەوە ئاسایی بوو کە تەنیا ئەندامان یاخود نوێنەرانی ئەم حزبە کوردییە نوێنەرایەتی کوردی عیراق بکەن لەم کۆنفراسەدا، کە بەنیشانەیەکی دیاری سەرەتاکانی مێژووی تاڵەبانی دەمێنێتەوە و شتی زۆری پێ بەخشی، لەو بارەیەشەوە دەڵێت: «ئێمە تاکە لایەن بووین کە نوێنەرایەتی کوردمان دەکرد، چونکە حزبی کوردی لە عیراقدا نەبوو، لە

کوردستان دوو ڕێکخراوی سیاسی هەبوون، یەکەمیان حزبی شیوعی لقی کوردستان و پارتی دیموکراتی کورد (پارتی) بوون».

دوای زیاتر لە دوو هەفتە کە مام جەلال لەگەڵ ئەندامانی دیکەی وەفدەکە لە بەغدا بەسەری برد، وەك خۆی وەسفی دەکات، وەك «سەرکەوتوویەك» گەڕایەوە بۆ کۆیە و دەڵێت: «وەك سەرکەوتووان گەڕاینەوە بۆ کۆیە، کۆبوونەوەمان ڕێکدەخست و باسی کۆنفرانسەکە و ئەوەمان بۆ خوێندکاران دەکرد کە لە بەغدا بینیومانە، هەروەها باسی ناوەڕۆکی برایەتی عەرەب و کورد و بنەماکانی خەباتی هاوبەشی عەرەب و کوردمان بۆ دەکردن، ئەو کاتە من لێپرسراوی لیژنەی قوتابییانی پارتی دیموکراتی کورد بووم، ساڵێك دوای ئەوە، واتە لە 1949دا بوومە ئەندامی لیژنەی ناوچەی حزبەکە لە کۆیە، واتە بەرزکرامەوە بۆ قۆناغێکی حزبی بەرزتر، ئەو کاتە عەلی عەبدوڵڵای ڕێکخەرمان لەگەڵدا بوو کە ئێستا جێگری سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانە».

تا ئەو کاتەش مەلا مستەفای بارزانی دامەزرێنەر و سەرکردەی پارتی دیموکراتی کورد لە عیراق، لە دەرەوەی وڵات بوو، چونکە دوای ئەوەی لەگەڵ هەڤاڵە کوردەکانیدا کۆماری مەهابادی کوردی لە ئێران ڕاگەیاند کە ڕژێمی شاهەنشاهی لە ئێران لەباری برد، بارزانی پەنای بۆ یەکێتیی سۆڤێت بردو لە مۆسکۆ مایەوە تا ساڵی 1959، بۆیە لەم ساڵانەی یەکەمی پەیوەندیکردنی تاڵەبانی بە حزبەوە دەرفەتی ئەوەی نەبوو سەرکردەکەی ببینێت. سەرەڕای ئەم هەموو سەرقاڵییە سیاسییەی کە مام جەلال لە منداڵییەوە هەیبوو، ئەوا لە

هەموو قۆناغەکانی خوێندنیدا سەرکەوتووی یەکەم بوو، چونکە یاسایەك هەبوو لە سالآنی حەفتاکاندا کاری پێکرایەوە، ڕێگەی دەدا بە خوێندکار نەچێتە تاقیکردنەوەی کۆتایی لە پۆلە ناکۆتا یاخود تاقیکردنەوە وەزارییەکان، ئەگەر لە نمرەی وەرزییەکانیدا تێکڕایەکی بەدەستهێنابێت بگاتە (90٪). (لە پەنجاکان و پێش پەنجاکان ئەگەر قوتابییەك لە پۆلی یەکەم و دووەمی ناوەندی و چواری دواناوەندی تێکڕای نمرەکانی 85٪ بوایە ئەوا لە تاقیکردنەوەی کۆتایی سالّ دەبەخشرا).

تالەبانیش لە هەمووان زیاتر سوودی لەم یاسایە وەرگرت، چونکە تاقیکردنەوەی کۆتایی قۆناغەکانی خوێندنی یەکەم و دووەمی ناوەندیی و چوارەمی دواناوەندیی نەکرد، لە کاتێکدا لە سالّی خوێندنی 1949- 1950 لە تاقیکردنەوەی وەزاری (بەکالۆریا) بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی بە یەکەم دەرچوو لەسەر ئاستی هەموو خوێندنگاکانی لیوا (پارێزگا)ی هەولێر. خۆیشی ئەوە دووپاتدەکاتەوە و دەلّێت: «لە ناوەندیی بەسەرکەوتوویی دەرچووم و هەمیشە یەکەمی قوتابخانەکەم بووم، سەرەڕای کاری سیاسیم، لە خوێندنی ناوەندیشدا زمانی عەرەبییەکەم بەرەو باشبوونێکی زۆر دەچوو، دەستمکرد بە لەبەرکردنی هۆنراوەکانی جەواهیری و ڕۆژنامەی «الاهالی» و کتێبی عەرەبیم دەخوێندەوە و وشە عەرەبییەکانم لە فەرهەنگی مونجیددا لەبەردەکرد و نمرەی تەواوم لە وانەی داڕشتنی عەرەبیدا وەردەگرت، لەبیرمە هۆنراوەیەکی جەواهیریم خوێندەوە کە بۆ لاواندنەوەی سیاسەتمەداری عیراق (جەعفەر ئەبو تممەن) بوو، دوو بەیتم لێ لەبەرکرد بەبێ ئەوەی ماناکەی بزانم، کە سەرەتاکەی دەلّێت:

٭ ذعر الجنوب فقيل كيد خوارج
وشكا الشمال فقيل صنع الجواري

پاشان پرسیارم لەبارەی مانای وشەکانی هۆنراوەکە کرد و تێیگەیشتم. هەروەها تاڵەبانی وتی: «کۆیە خوێندنگەی دواناوەندیی لێ نەبوو، لەبەرئەوە دەبووایە بچمە هەولێر بۆ تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندیی لەوێ، لەگەڵ هەولێریشدا قۆناغێکی دیکەی مێژووی ژیان و سیاسیم دەستپێدەکات».

جەلال تاڵەبانی شتی زۆری بەدەستهێناوە بە بەراورد بە تەمەنی، چونکە ئەندامی لیژنەی ناوچەی یەکەم و گەورەترین حزبی سیاسی کوردی بوو لە عیراق و ڕێبەرایەتی ڕێکخستنەکانی کۆیە و هەولێر و کەرکوکی دەکرد کە هێشتا تەمەنی هەژدە ساڵی تێنەپەڕاندبوو، بگرە دەستگیریش دەکراو نەفی دەکرا بۆ شارێکی دیکە لەگەڵ سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کورددا، سەرەڕای ئەوەش لە خوێندنەکەیدا سەرکەوتوو بوو و بەرزترین تێکڕای لە دواناوەندیدا بەدەستدەهێنا کە بەشایستەییەوە زەمینەی بۆ ڕەخساند کۆلێجی پزیشکی لە زانکۆی بەغدا بخوێنێت کە بەرزترین کۆلێجی زانکۆ بوو لە عیراق، کاتێکیش دەسەڵاتداران ڕێگەیان نەدا بچێتە کۆلێجی پزیشکی، حقوقی هەڵبژارد تا ببێتە پارێزەر، لەیەکەم ئەزموونی کاریشیدا وەك پارێزەر دەچێتە ڕیزی ئەو کرێکارانەوە کە سکاڵایان لەو کۆمپانیایە هەیە کە دەبووایە ئەم داکۆکی لێ بکات.

لە بەغداش کە تاڵەبانی وەك خوێندکاری کۆلێجی حقوق و ئەندامی لیژنەی ناوچەی حزبێکی قەدەغەکراو تێیدا

نیشتەجێ دەبێت، دەخرێتە ژێر چاودێری دەزگا ئەمنییەکانەوە، بەڵام ئەمە ڕێگر نابێت لەوەی سەفەر بکات بۆ پۆڵۆنیا و چین و یەکێتیی سۆڤێت، بۆیە لە مۆسکۆ زۆر هەوڵدەدات تا یەکەم دیدار لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی شۆڕشی کورد ئەنجام بدات، ئایا ئەم دیدارە دێتەدی؟ لە بەشی داهاتوودا سەرۆکی عیراق باسی یەکەم سەردانی بۆ دەرەوەی عیراق و خوێندنی لە کۆلێجی حقوق و چۆنێتیی دەرکردنی دەکات.

جەلال تاڵەبانی لە دواناوەندیی کەرکوک دەرچوو، بڕوانامەی بەکالۆریای بە سەرکەوتوویی بە تێکڕایەکەوە بەدەستهێنا کە بواری بۆ ڕەخساند لە کۆلیجی پزیشکی لە زانکۆی بەغدا بخوێنێت، بەڵام کۆلیجەکە پەیوەندیکردنی ئەوی قبوڵ نەکرد، وەك خۆی هۆکاری ئەوە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: «لە کۆلیجی پزیشکی قبوڵ نەکرام لەبەر ئەوەی ئەوەم وەرنەگرتبوو کە پێیاندەوت (وثیقة حسن السلوك)، ئەم جۆرە بەڵگەنامەیەش لە لایەنێکی ئەمنییەوە دەردەچوو کە پێیاندەوت (فەرمانگەی لێکۆڵینەوەی جینائی)، لەبەرئەوەش کە چەند جارێك دەستگیرکرابووم، تەنانەت کاتێك کە لە کەرکوکیش بووم لە کاتی خوێندنی دواناوەندیدا دووجار دەستگیرکرام و هەمیشە لەژێر چاودێری پۆلیسی نهێنیدا بووم، لەبەرئەوە نەمتوانی گەواهینامەی هەڵسوکەوت باشی وەربگرم، لەبەرئەوە هەڵبژاردنی دووەمم خوێندن بوو لە کۆلیجی حقوق»، هەروەها وتی: «لە ساڵی خوێندنی 1952- 1953 چوومە کۆلیجی حقوق لە زانکۆی بەغدا و قبوڵنەکردنم لە کۆلیجی پزیشکی هیچ کاریگەرییەکی بەجێنەهێشت هەرچەندە شایستەی ئەوەبووم وەربگیرێم، چونکە بەسەرکەوتوویی دەرچووبووم، مەسەلەکەم وەك تەنیا گواستنەوە لە کۆلیجێکەوە بۆ کۆلیجێکی تر وەرگرت، لەبەرئەوەش کە لەدوای پزیشکیی حەزم لە حقوق بوو و ئاواتەخوازبووم ببمە پارێزەر و لەپاڵ سیاسەتدا پارێزەریی بکەم، بۆیە بڕیارم دا لەم کۆلیجە بخوێنم، کاتێکیش دەرچووم تەنیا دووجار پارێزەرییم کرد، یەکەمجار ئەوەبوو کاتێك ئیبراهیم ئەحمەد دەستگیرکرا و خرایە زیندانەوە لە ساڵی 1960دا ئەوکاتەی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (خەبات) بوو، لەگەڵ کۆمەڵێك پارێزەری تردا خۆبەخشانە داکۆکیمان لێکرد.

له جاری دووهمیشدا پارێزەری کۆمپانیایەك بووم كە خاوەنەكەی بزنسمانی ناسراوی كورد ڕەشید عارف بوو، كە لە پێشەنگی یەكەمی دیموكراتیخوازەكانە، لە كۆمپانیاكەی دایمەزراندم بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات و مووچەیەكی باش وەربگرم، بەرێكەوت 17 كرێكاری داوایەكیان لەدژی كۆمپانیاكە پێشكەشكرد و داوای قەرەبووی ماددییان كرد، منیش بەوپێیەی پارێزەری كۆمپانیاكەبووم، چووم بۆ دادگا و دانم بەوەدانا كە كرێكارەكان مافی خۆیانە قەرەبوو بكرێنەوە و بە دادوەرەكەم وت: بەڵێ... ئەوە مافی خۆیانە، بڕیاریش دەرچوو كە قەرەبوو بكرێنەوە، چاوەڕوانیشم كرد تا حوكمەكە لە دادگای پێداچوونەوە پەسەندكرا و پلەی قەتعی وەرگرت، واتە دەبێت بڕیارەكەی دادگا جێبەجێ بكرێت و دادگاش بڕیارەكەی بۆ سەرۆكی كۆمپانیاكە نارد و داوای لێكرد قەرەبووەكان بدات، لەبەرئەوەی بڕیارەكە پلەی قەتعی وەرگرتووە و پارێزەری كۆمپانیاكە دانی بەوەداناوە كە كرێكارەكان مافی خۆیانە قەرەبوو بكرێنەوە، بۆیە ڕەشید عارف ناردی بەودوامدا و زۆر توڕەبوو، منیش هۆكارەكەم دەزانی و خۆم ئامادەكردبوو بۆ وەڵامدانەوەی، كاتێكیش چوومە نووسینگەكەی لێیپرسیم و وتی: ئەفەندی تۆ پارێزەری كۆمپانیاكەیت یان پارێزەری پرۆلیتاریایت؟ منیش وتم: پارێزەری كۆمپانیاكەم، ئەویش وتی: بۆچی واتكرد ئەفەندی؟ منیش وەڵامم دایەوە كە ئەوەم بۆ بەرگریكردن لە ناوبانگتان و ناوبانگی كۆمپانیاكە كردووە، چونكە من لە منداڵییەوە دەتانناسم و دەزانم كە ڕەشید عارف پیاوێكە لە پێشەنگی یەكەمی دیموكراتخوازەكان و تۆ هاوڕێی كامل چادرچی و جەعفەر ئەبو تممەن-یت (كە سیاسەتمەداری عیراقی نیشتمانپەروەری دیموكراتیخوازبوون

لەسەردەمی پاشایەتیدا) و پێم ناخۆشە هەندێك كرێكار سكاڵات لەسەر تۆماربكەن، ئەمەش خراپە بۆ ناوبانگت وەك پیاوێكی پێشكەوتنخواز و دیموكراتیخواز، نرخی ئەو قەرەبووە سادەیە چییە لە بەرامبەر ناوبانگی ئێوەدا كە هەموو پارەی دونیا دەهێنێت، ئەویش هێوربووەوە و سەیریكردم و وتی: ئافەرین باشتكرد».

لە بەغدا، لەو شارە فراوانەدا، ئەركەكانی مام جەلال فراوانبوون، بەتایبەتی كە بوونی لە پایتەخت بە سیفەتی نیشتەجێبوو، نەك میوان یاخود تەنیا بەشداربوویەكی كۆنفرانسێك، لەوبارەیەشەوە دەڵێت: «بوومە ئەندامی لیژنەی ناوچەی حزب و دەستمكرد بە كاركردن لە ڕیزی خوێندكاراندا، هەروەك لەنێو كوردە فەیلییەكانیشدا كارمكرد بۆ ڕاكێشانی ئەندامی تازە بۆ حزب. ڕێكخستنەكانی حزب زۆر نهێنیبوون، چونكە ئەندامانی ڕاوەدوو نراوبوون، حزبیش قەدەغەكراوبوو و بەتەواوی بە یەكێك لە حزبە مەترسیدارەكان دادەنرا وەكو حزبی شیوعی، پەیوەندیم لەگەڵ هەموو خوێندكاران و لە هەموو حزبەكان باشبوو، بۆ یەكەمجاریش من پەیوەندیم لەگەڵ كۆمەڵێك خوێندكاری بەعسیدا دروستكرد كە لە دارولموعەلیمینی عالی دەیانخوێند، لەوانەی كە لەبیرم بن عەبدوڵڵا سەلوم سامەڕائی، دیداریشم لەگەڵیان هەبوو، دواتر دیدارم لەنێوان خوێندكارانی كورد و خوێندكارە بەعسییەكاندا ڕێكخست، ئەوەش لە ساڵی 1953دا بوو، گفتوگۆكانمان گشتی بوون لەبارەی خەباتی عەرەب و كورد لەدژی ئیستیعمار و برایەتی عەرەب و كوردەوە بوون، بەڵام هەڵوێستێكی ڕوونیان لە بەرامبەر كێشەی كورد نەبوو».

ئەو کاتە حزبی کوردی چ عیراقی یاخود غەیرە عیراقی جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان لە عیراقدا نەبوو و حزبێکی تر کە هەمان ناوی هەبوو لە ئێران، ئەگەر تاڵەبانی باسی ئەوە بکات کە حزبی بەعس هەڵوێستێکی ڕوونی لە بەرامبەر کێشەی کورد نەبووە، ئەوا هەڵوێستی حزبە سیاسییەکانی دیکەی عیراقیش لە بەرامبەر کێشەی کورددا کورتدەکاتەوە و دەڵێت: «ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ساڵانی چلەکان کە مۆڵەت بە حزبەکان درا لە عیراقدا، ئەوا دەبینین هەڵوێستی حزبی دیموکراتی عیراق بەرامبەر بە کێشەی کورد دەڵێت: گەلی کورد مافی چارەی خۆنووسینی هەیە، هەروەها هەڵوێستی هەردوو پارتی گەل و حزبی نیشتمانیی دیموکراتی دۆستانەبوو و دانیان بە کورد و مافەکانی کورددا دەنا، بەڵام ئەم هەڵوێستەیان لەلا بەرجەستە نەبوو، هەرچی هەڵوێستی حزبی شیوعی عیراقیشە ئەوا لە ساڵی 1935وە ڕوونبوو، واتە لە قۆناغی یەکەمی دامەزراندنییەوە، دروشمی سەربەخۆیی کوردستانی هەڵگرتبوو، لە ساڵانی چلەکانیشدا دروشمی یەکسانی نێوان کەمینەکانی بەرزکردەوە، بەم جۆرە ناوی کورد و ئێزدی و تورکمانیان لێنا، دواتر ڕەخنە لە حزبی شیوعی گیرا لەسەر ئەم هەڵوێستەی تەنانەت لەلایەن ئەندامەکانیشیەوە، تەنانەت شیوعییەکان خۆیان وتیان حزب لە وتارەکانیدا دانی ناوە بە مافەکانی گەلی کورد و مافی چارەی خۆنووسین و جیابوونەوەی لەکاتی گونجاودا و بەپێی بەرژەوەندییەکانی هەتا پێش ڕزگارکردنی عیراق لە ئیستعماریش بەگوێرەی وتارێکی بەناوبانگی هەڤاڵ فەهد (دامەزرێنەری حزبی شیوعی عیراق)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرنامەکەیدا ئەم ماددەیە هاتبوو کە باسمانکرد (یەکسانی لەنێوانە کەمینەکاندا)

کە پێچەوانەی ڕاستییەکانە، لە ساڵی 1951یشدا ئەو خاڵە لەوەی کە پێیدەڵێن پەیمانی (بازل) چاککرا و مافی گەلی کورد لە چارەی خۆنووسین و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی پەسەند کرا». هەروەها تاڵەبانی وتی: «بەر لەوەی حزبی شیوعی بگاتە ئەم هەڵوێستە، پارتی گەل هەبوو پێش ئەوەی خەباتی بگۆڕێت بۆ نهێنی، ناوی خۆی گۆڕی بۆ حزبی یەکێتی شیوعییەکان و عەزیز شەریف خاوەنی ڕۆژنامەی «الوطن» و لێپرسراوی حزب بە ناوێکی خوازراوەوە دەینووسی کە (النصیر) بوو، لەژێر ئەم ناوەدا نامیلکەیەکی سەبارەت بە مەسەلەی کورد لە عیراق بڵاوکردەوە کە تێیدا مافی گەلی کوردی لە چارەی خۆنووسین دووپاتکردەوە و تێیدا ڕەخنەی لە هەڵوێستی حزبی شیوعی و هێزە شیوعییەکانی ئەوکاتە گرت سەبارەت بە کێشەی کورد. سەبارەت بە حزبە نەتەوەییە عەرەبییەکانیش ئەوا یەك حزبی نەتەوەیی هەبوو ئەویش حزبی سەربەخۆیی بوو، هیچ دەقێکی ڕوون نییە لە ئەدەبیاتی ئەم حزبەدا سەبارەت بە کورد و کێشەی کورد، بەڵام دەقێك هەیە دەڵێت: حزب ئەوەی بۆ نەتەوەی دووەم دەوێت کە بۆ گەلەکەی خۆیشی دەیەوێت، بەهەرحاڵ هیچ هەڵوێستێکی دژ بە گەلی کورد لە عیراقدا نەبوو».

زیاتر لە ئەرکێك و زیاتر لە بەرپرسیارێتییەك لە چاوەڕوانی تاڵەبانیدا بوون وەك خۆی ڕوونیدەکاتەوە: «لە یەنایەر (کانوونی دووەم)ی ساڵی 1953دا کۆنگرەی سێیەمینی پارتی دیموکراتی کوردستان-مان ڕێکخست، لەم کۆنگرەیەدا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزب هەڵبژێردرام، تەمەنم 20 ساڵ بوو، ڕاسپێردرام کە یەکێتی قوتابیانی کوردستان پێکبهێنم، لە فبرایەر (شوبات)ی ئەو ساڵەدا، واتە دوای مانگێك لە بەستنی کۆنگرەی حزب، یەکێتیی

قوتابیانی کوردستانی عیراقمان پێکهێنا کە بە سکرتێری گشتیی هەڵبژێردرام».

تاڵەبانی دەڵێت: «مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی حزب هێشتا لە مۆسکۆ بوو، پەیوەندییەکی ڕاستەخۆی بە حزبەوە نەبوو، بەڵکو هیچ ڕێنماییەکیشی نەنارد، مەکتەبی سیاسی بوو کە حزبی بەڕێوە دەبرد، ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری حزبی لێبوو، هەروەها نوری شاوەیس ئەندامی مەکتەبی سیاسییش، هەرچی بارزانیشە لە هەموو کۆنگرەیەکی حزبدا بە سەرۆك هەڵماندەبژاردەوە بەبێ ئەوەی خۆی لەوێ بێت».

قۆناغی خوێندنی زانکۆ دەرفەتی زۆری بە تاڵەبانی بەخشیبوو کە دیارترینیان سەفەر بوو بۆ دەرەوەی عیراق، تەنانەت خۆیشی دان بەوەدادەنێت و دەڵێت: «لەمیانی خوێندنمدا لە کۆلێجی حقوق بۆ یەکەمجار سەفەرم کرد بۆ دەرەوەی عیراق، ئەوەش لە ساڵی 1955دا بوو بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی لاوان و قوتابیانیی جیهان لە وارشۆ، کە من و هەندێك لاوی کورد لە وەفدی عیراقدا بووین، لەوێ بەناوی لاوانی کوردەوە دیاری کوردیمان بەسەر هەندێك لە وەفدەکاندا دابەشکرد، هەروەك ڕێگەیان پێداین ئاهەنگێك ساز بکەین و چەند وەفدێکی جیهانمان بۆ بانگهێشتکرد لە بەریتانیا و فەرەنسا و هیندستان و دەوڵەتانی سۆشیالیستی و پۆڵۆنیا و یەکێتیی سۆڤێت و چینی میللی و سودانەوە، ئەم وەفدانە هیچیان لەبارەی بارودۆخی کورد و نەهامەتییەکانی و خەباتیەوە نەدەزانی، چەند وتەیەکمان لەبارەی کێشەی کورد و خەباتی گەلی کوردەوە پێشکەش کرد، بەم بۆنەیەشەوە هەڵپەڕکێی کوردیمان نمایشکرد، بەڵام ژمارەی ئەو کچانەی لەگەڵمان بوون کەمبوون، بۆیە بوشرا برتۆ (کە کەسایەتییەکی پێشکەوتنخوازی

عیراقییه و بایەخ بە بارودۆخی ژنان دەدات) بە خۆبەخش جلوبەرگی کوردی لەبەرکرد و بەشداری لە چالاکییەکەماندا کرد، لە دیارترین ئەو کەسانەی ئامادەی ئەم ئاهەنگە بوون، شاعیری ناسراوی تورك نازم حیکمەت بوو، کە ئامادەبوونەکەی بایەخێکی بە ئاهەنگەکەمان و کۆنگرەکەش بەگشتی بەخشی، بگرە وتارەکەی جێی بایەخی هەموو وەفدە بەشداربووەکان بوو، کە هاوسۆزییەکی زۆری لەگەڵ کێشەی کورد پیشان دا و داوای ڕزگاربوونی گەلی کوردی کرد و وتی: من داوا لە لاوانی کورد دەکەم کە کاتێك ئالآی کوردستان لەسەر خاکی خۆیان هەڵدەکەن، بانگهێشتم بکەن بۆ ئەوەی بەچاوی خۆم ئەو ڕۆژە مێژووییە چاوەڕوانکراوە ببینم. ئەم وتەیە کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر وەفدەکانی دیکە، بۆیە کە هەر وەفدێك وتەکەی خۆی پێشکەش دەکرد تێیدا دەیوت: پالپشتی خەباتی گەلی کورد دەکەین و پشتیوانی کێشە ڕزگاریخوازەکەی دەکەین. جا ئەو وەفدانە کێشەی کورد و گەلی کوردیان بناسییایە یان نەیانناسیایە». هەروەها تالەبانی وتی: «ئێمەی کوردی عیراق تاکە کەس بووین کە وەك خوێندکاران و لاوانی کورد خۆماننناساند، تەنیا ئێمە چالاکیمان هەبوو، لەکاتێکدا کوردی ئێران و سوریا لە وەفدەکانی ئێران و سوریادا بوون و بایەخیان نەدا بە ناساندنی کێشەی کورد، چونکە لە هەردوو حزبی شیوعی ئێران و سوریا بوون، هەروەها هاوسەری عەبدولڕەحمان قاسملوش ئامادەبوو کە لە ئێرانەوە هاتبوو».

کۆنگرەی لاوان و قوتابیانی جیهان لە وارشۆ دەرگای لەبەردەم تالەبانیدا والآکرد کە نوێنەرایەتیی خوێندکارانی کوردی کرد بەوپێیەی سکرتێری گشتیی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بوو، هەروەك بەباشترین شێوە نوێنەرایەتیی کێشەی کوردی کرد، لە

ئاكامی ئەوەشدا تاڵەبانی دەڵێت: «چین داوەتێکی ئاراستەکردم بەناوی خۆمەوە بۆ ئەوەی سەردانی بکەم، هەروەك داوەتێکیشیان ئاراستەی ئەندامێکی عەرەبی عیراقی کرد لە وەفدەکەماندا، واتە کوردێك و عەرەبێکیان لەپاڵ وەفدی دیکە لە دەوڵەتانی ترەوە بانگهێشتکرد، پاش کۆتایی هاتنی کارەکانی کۆنگرەی لاوانی جیهان لە وارشۆ بە شەمەندۆفێر چووین بۆ چین و بە یەکێتیی سۆڤێتدا تێپەڕین».

مام جەلال بەردەوام دەبێت لەسەر قسەکانی سەبارەت بەم گەشتە مێژووییەی ژیانی و دەڵێت: «گەیشتینە چین و مانگێك لەوێ ماینەوە و بەناوی خوێندکاران و لاوانی کوردستانەوە چەند چالاکییەکمان ئەنجام دا».

ئەوەی ئەو کاتە زیاتر تاڵەبانی سەرقاڵ کردبوو، دیداری مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی شۆڕشی کورد و سونبولی گەورەی خەباتی کورد و زۆربەی عیراقییەکانی غەیرە کورد بوو، لەو بارەیەشەوە دەڵێت: «لە کاتی گەڕانەوەماندا لە مۆسکۆ مامەوە و هەوڵم دا مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان ببینم کە لەوێ نیشتەجێ بوو، سەرکەوتوو نەبووم لە بینینی، بەڵام چاوم بە کەسایەتییەکی عیراقی ناسراو کەوت ئەویش محەمەد هاشم نەجەفی بوو کە بێژەریی دەکرد لە ڕادیۆی مۆسکۆ بە زمانی عەرەبی، یەکترناسینمان بە ڕێککەوت بوو، چونکە دوای ئەوەی ڕێگەچارەم نەما بۆ بینینی بارزانی و ناونیشانیم نەدەزانی و نەمدەزانی چۆن بیگەمێ. ڕۆژێکیان لە شەقامی گۆرکێ پیاسەم دەکرد گوێم لە دوو کەس بوو بە زمانی عەرەبی شێوەزاری عیراقی قسەیان دەکرد، نەجەفیم لەڕێی دەنگییەوە ناسییەوە، چونکە ڕۆژانە لە ئێستگەیەکی ئاڕاستەکراوەوە بەرنامەی پێشکەش دەکرد و ئێمەش گوێمان لەو ڕادیۆیە دەگرت، دەنگی لەلامان ناسرابوو، بۆیە لە پشتیانەوە ڕۆیشتم و بەپەلە چووم لەبەردەمیاندا وەستام و وتم: سڵاوی خواتان لێ بێت مامۆستا محەمەد مەهدی، پێیوتم: من محەمەد مەهدی نیم، ئەویش بۆئەوەی کەسایەتیی خۆی بشارێتەوە لەبەر هۆکاری ئەمنی، منیش پێموت: هیوادارم نیگەرانم نەکردبیت، چونکە من لە ڕێی دەنگتەوە دەتناسم و ڕۆژانە لە ڕادیۆی مۆسکۆوە گوێمان لێت دەبێت، منیش لاوێکی کوردم بەشداریم لە میهرەجانی وارشۆ کرد و چووین بۆ چین و لەوێوە گەڕاومەتەوە، خۆشم پێناساند بەوپێیەی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بووم و پێموت کە بارزانی

سەرۆکمان لێرەیە و نامەیەکی گرنگم پێیە دەبێت پێی بگەیەنم، بۆیە هیوادارم یارمەتیم بدەیت بۆ ئەوەی بیگەمێ، پاشان پرسیاری ناوی ئەو ئوتێلەی لێکردم کە لێی دابەزیوم لەگەڵ ژمارەی ژوورەکە و وتی: سبەینێ دێمە لات، وادیاریشە لە ناسنامەکەم دڵنیاببوو، چونکە بۆ ڕۆژی دواتر هاتە لام و وتی مەلا مستەفا لێرەیە، بەڵام ئەم جارە نایبینیت، ئەگەر هەر نامەیەکت لەلایە من پێی دەگەیەنم، بۆیە نامەکەم دایە، دواتر بردمی بۆ ڕادیۆی مۆسکۆ و وتەیەکم لە ڕێی ڕادیۆکەوە بەناوێکی خوازراوەوە پێشکەش کرد کە ئەویش (حەمە ئەمین) بوو».

تاڵەبانی ئەوەش دەخاتەڕوو کە ئەو کاتە ئاواتەخواز بووە بارزانی ببینێت و دەڵێت: «بەکردەوە ئاواتەخوازبووم لە مۆسکۆ بارزانی ببینم، بەڵام کاتێك نەمتوانی ئەو کارە بکەم، ئەوە کاردانەوەی لە ناخمدا بەجێ نەهێشت، چونکە نەجەفی کە نامەکانی لێ وەرگرتم ئومێدی زۆری پێدام و کە گەڕایشەوە هەندێك ڕاسپاردەی لە بارزانییەوە بۆ حزب پێبوو، هەروەك ناونیشانی کەسێکی ئێرانی پێدام کە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا نیشتەجێبوو بۆ ئەوەی لەڕێگەی پۆستەوە ببێتە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ئێمە و سەرۆکی حزب، کە دەمانتوانی لەڕێی ئەو ناونیشانەوە هەرچییەکمان بوێت بۆ بارزانی بنێرین، هەروەك وشەیەکی نهێنی پێدام کە دەمتوانی جاری داهاتوو دیداری پێ ئەنجام بدەم، واهەستم کرد کە لە میانی ئەم گەشتەدا پەیوەندییەکمان لە نێوان ئێمە و مەلا مستەفا بارزانی و سەرکردەکانی دیکەی حزب دروست کرد کە لەگەڵیدا بوون لە مۆسکۆ، لەڕێی ناونیشانەکەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوایشەوە توانیم بۆ

دکتۆر عەبدولعەزیز شەمزینی و موقەدەم میر حاجی ئەحمەد بنووسم کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حزبەکەمان، بەڵام لە ساڵی 1957دا لەمیانی بەشداریکردنم لە میهرەجانی لاوانی جیهان گەڕامەوە مۆسکۆ و لەوێ توانیم بارزانی ببینم، ئەمەش چیرۆکێکە کە دوایی دەیگێڕمەوە».

مام جەلال بە پاسپۆرتەکەی خۆی نەچوو بۆ وارشۆ، چونکە لەبەر هۆکاری ئەمنی پاسپۆرتی نەبوو، بەڵام چۆن توانی سەفەر بکات؟ لەوەڵامدا دەڵێت: «کاتێك سەفەرم کرد بۆ وارشۆ و چین پاسپۆرتێکی عیراقیم بەکاردەهێنا هی خۆم نەبوو، چونکە پاسپۆرتیان بۆ دەرنەکردم، بۆیە بە پاسپۆرتی لاوێکەوە سەفەرم کرد ناوی محەمەد سادق موسا بوو کە لە برایانی کوردی فەیلی بوو، هەر بە هەمان پاسپۆرتیشەوە گەڕامەوە بۆ عیراق و خۆمشاردەوە تا چوومەوە بۆ کۆلیج، بۆیە لەسەر ئەو وتەیەی لە ڕادیۆی مۆسکۆوە پێشکەشم کرد دەستگیرکرام و لێکۆڵینەوەم لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە لەگەڵ کرا، بەڵام من بەتەواوی نکوڵیم لێکرد و وتم من پاسپۆرتم نییە و عیراقم بەجێ نەهێشتووە ئیتر چۆن گەیشتمە مۆسکۆ و لەوێ وتەم پێشکەشکرد، بەڵام ڕەوانەی دادگایان کردم و دادگاش لیژنەیەکی تەکنیکی پێکهێنا بۆ دڵنیابوون لە دەنگم و ئەو کاسێتەی دەنگمی تێدابوو، کە لە فەرمانگەی لێکۆڵینەوەی جینائی تۆماریان کردبوو، لەبەر ئەوەش کە دەنگەکە بەتەواوی ڕوون نەبوو و لەبەر ئەو تەشویشەی لە تۆمارکردنەکەدا هەبوو، لیژنەکە ڕاپۆرتی خۆی پێشکەشکرد کە دەڵێت لەوانەیە دەنگی من بێت و لەوانەشە دەنگی من نەبێت، لەبەرئەوەش لە دادگادا گومان بۆ بەرژەوەندی تۆمەتبار لێکدەدرێتەوە، بۆیە دادگا ئازادیکردم. بەهۆی

ئەوەشەوە کە غیابم زۆربوو لە کۆلیج بەهۆی سەفەر و پاشان دەستگیرکردنم و لێکۆڵینەوە و دادگاش، کە غیابەکانم حەفتا ڕۆژی تێپەڕاندبوو، بۆیە لە کۆلیج فەسڵکرام».

مەسەلەی فەسڵکردنی لە کۆلیجی حقوق بەهۆی غیابەوە، نەبووە فاکتەری دواخستن یاخود تەگەرە لەبەردەم کاروانە سیاسییەکەیدا، چونکە ئەوەی قۆستەوە تا بە هەوڵێکی زۆرترەوە لەناو حزبدا کاربکات و ساڵی داهاتوو بگەڕێتەوە بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی لە حقوق، لەو بارەیەشەوە ڕوونیدەکاتەوە و دەڵێت: «درێژەمدا بە کارەکەم لە ناو حزبدا بۆ ئەوەی ساڵی داهاتوو (1956) بگەڕێمەوە بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەم، ئەو کاتەش خۆپیشاندان لە بەغدا لە دژی هێرشی سێ قۆڵی بۆ سەر میسر ڕوویدا، منیش بەشداریم لەم خۆپیشاندانەدا کرد و وتەم لە نێو خۆپیشاندەران و کۆبوونەوەی دیکەدا پێشکەش دەکرد، بۆیە فەرمانی دەستگیرکردنم بۆ دەرچوو، بەڵام خۆمشاردەوە، چونکە دڵنیابووم کە ئەم جارە ڕەوانەی دادگای عورفیم دەکەن، ئەگەر ڕەوانەی ئەم جۆرە دادگایانەشیان بکردمایە ئەوا زیندانی دەکرام، چونکە دادگای عورفی دانی بە یاسا قەزاییەکاندا نەدەنا، بەڵام ئەوەی لە ناکاو بوو ئەوەبوو کە کۆلیجی حقوق لەلایەن خۆیەوە بڕیاری دا بەشێوەیەکی کۆتایی فەسڵم بکات بەهۆی دووبارەبوونەوەی غیاب و بەشداریکردنەکانم لە خۆپیشاندانەکان و چالاکیی سیاسیم و بەتۆمەتی ئەندامێتیم لە (انصار السلام) (ڕێکخراوێکی سەر بە حزبی شیوعی عیراق بوو)، تەنیا دکتۆر حەسەن چەلەبییش بەرهەڵستی بڕیارەکەی ئەنجومەنی کۆلیجی کرد و داکۆکی لێکردم بەوپێیەی خوێندکارێکی سەرکەوتوو بووم و وتی کە هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر ئەوەی ئەندام بم لە

(انصار السلام) و ئەوەی ڕەتکردەوە ئیمزای بڕیاری دەرکردنەکەم بکات بەپێچەوانەی ئەوانی دیکەوە کە ئیمزایان خستبووە سەر بڕیارەکە».

هەروەها تاڵەبانی دەڵێت: «لە ئەنجامی ئەوەدا لە ساڵی 1956وە خۆمشاردەوە تا بەرپابوونی شۆڕشی 14ی تەمموزی 1958 و بەردەوامبووم لە خەباتی سیاسی و بەرپرسیارێتییە حزبییەکەم، لە نێوان کەرکوك و سلێمانیدا خۆمشاردبووەوە، زۆر جاریش لە بارەگای حزب لە سلێمانی دەمامەوە، چونکە لێپرسراوی دەرکردن و چاپکردنی ڕۆژنامە نهێنییەکەی حزب بووم بە ئامێری (ڕۆنیۆ)، ئەو کاتەش دەستم بە کاروانی نووسین بۆ ڕۆژنامە کرد، لە ساڵی 1963دا نامیلکەیەکم نووسی بەناوی (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بۆچی؟) بەزمانی عەرەبی بوو، پاشان وردە وردە دەستمکرد بە نووسینی وتار. لە ساڵی 1958یشدا لە خۆشاردنەوە هاتمەدەرەوە و گەڕامەوە بۆ کۆلیجی حقوق و لە ساڵی 1959دا خوێندنەکەم تەواو کرد، دەشمتوانی ئەو ساڵە زیادەیە نەخوێنم، چونکە من لە پۆلی چوارەم بووم کە دەرکرابووم و حوکمی تازەی کۆمارییش ساڵێك بەرزکردنەوەی بە خوێندکاران بەخشی کە ئەوکاتە پێیان دەوت (زەحف)، واتە ئەوەی لە پۆلی سێیەم بووایە دەچووە پۆلی چوارەم، بەڵام من ئەوەم ڕەتکردەوە کە سوود لەم بڕیارە وەربگرم و سووربووم لەسەر ئەوەی ساڵی کۆتایی بخوێنم و بەشێوەیەکی ئاسایی دەربچم و ئەوەم ڕەتکردەوە بە زەحف ببمە پارێزەر».

سەرۆك جەلال تاڵەبانی لە سەعات هەشتی بەیانیدا بەتەواوی ئامادەیە بۆ ئەنجامدانی چالاکی و بەرپرسیارێتییەکانی ڕۆژانەی، بەرچایی بە کەمێك پەنیری سپی خۆماڵی دەکات کە ڕێژەی

چەورییەکەی کەمە لەگەڵ پیاڵەیەك چایی، پاشان دەستدەکات بەو بەرنامەیەی پێشتر بە ڕێککەوتن لەگەڵ سکرتاریەتەکەی و ڕاوێژکارانی ئامادەکراوە. لەو هەفتانەی لەنزیکییەوە بەسەرمبرد لە هاوینەهەواری دوکان، زۆربەی کاتەکانی لە کۆبوونەوەی حزبیدا بەسەر دەبرد، چونکە لەبەردەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی و پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بوون و حزبەکەی هاوپەیمان بوو لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان کە مەسعود بارزانی سەرۆکایەتی دەکات، لە نێوان کۆبوونەوەیەك و کۆبوونەوەیەکی تریشدا پێشوازی لە میوانێك یاخود وەفدێك دەکرد.

سەعات دوو کاتی نانی نیوەڕۆی سەرۆك تاڵەبانییە، کە خواردنەکەی هەمیشە پێکدێت لە گۆشتی قەلی برژاو یاخود کولاو و برنجی سپی و شلەی بامێ و شلەی سەوزەی تری وەك باینجان یان فاسۆلیا و شۆربای سەوزە یان نیسك و نان، هەمیشەش حەزدەکات نانی نیوەڕۆی لەگەڵ کۆمەڵێك بخوات نەك بەتەنیا، ئەوا یان لەسەر خوانەکەی میوانی لێ دەبێت کە خۆی بەمەبەست کەسانی دیکە بۆ خوانەکەی بانگ دەکات، یاخود نانی نیوەڕۆ لەگەڵ یاریدەدەرانیدا دەخوات.

لە ڕۆژی دواتری دیدارەکەمان لە دوکان کاتێك نانی نیوەڕۆمان دەخوارد لەبارەی ئەو خواردنانەوە لێم پرسی کە حەزیان لێدەکات، ئەویش وتی: «بەپلەی یەکەم شلەی بامێ لەگەڵ برنج» پاشان وتی: «بامێ تاڵەبانییە، ئێمە بنەماڵەیەکین حەزمان لە بامێیە لەو کاتەوەی کە پێدەگات تا کۆتایی وەرزەکەی». ئینجا ئاماژەی بۆ قاپێك کرد کە بە نان داپۆشرابوو وتی: «هەروەها حەزیشم لەو شتەیە کە لەو قاپەدا

شاردراوەتەوە»، ئەو شتە شاردراوەیەش کەبابی سلێمانی بوو کە لە گۆشتی بەرخی قیمەکراو و برژاو دروست دەکرێت، وادیاریشە کەباب بۆ تەندروستییەکەی گونجاو نییە بۆیە زۆر جار لێی دووردەخەنەوە، بەڵام چەند پارچەکی بچووکی هەر لێ دەخوات.

لە سەعات دوو و نیوی پاشنیوەڕۆش پشوویەکی کەم دەدات بەسەیرکردنی دیمەنە سەرنجڕاکێشەکانی دەوروبەری و پیاڵەیەك چایی دەخواتەوە و گوێ لە گۆرانییە کوردییە کۆنەکان دەگرێت و چێژ لە دەنگی گۆرانیبێژەکان وەردەگرێت و گۆرانییەکانیان لەگەڵ دەڵێتەوە، لێمپرسی کە گوێ لە گۆرانی عەرەبی دەگرێت یان نا؟، لەوەڵامدا وتی: «بەڵێ من گوێ لە نازم غەزالی و محەمەد قوبانچی و سەلیمە موراد دەگرم، هەروەك گوێش لە ئوم کەلسوم و خانم فەیرۆز و عەبدولوەهابیش دەگرم».

ئەوە ڕۆژە مەوعیدم لەگەڵ سەرۆك تاڵەبانی سەعات یانزەی بەیانی بوو، بینیم لە نووسینگە بچووکەکەی لە خانووەکەی لە هاوینەهەواری دوکان دانیشتووە و لە پەنجەرەکەوە لە شاخەکانی دەوروبەری خانووەکە ڕادەمێنێت و گوێی لە دەنگی باڵندان دەبێت، قاوەی بۆ بانگکردم و دەستپێشخەری کرد و وتی: «دەی بپرسە؟ با دەست بە قسە بکەین».

سەرۆك تاڵەبانی یادەوەرییەکی زۆر زیندووی هەیە، چونکە هیچ ناوێك یاخود ڕووداوێك یان ناونیشانێك یا مێژوویەکی لە بیر ناچێتەوە، بەوێنەی گەنجێکی چوست و چالاك قسەدەکات، تەنانەت قسەکانیشی بەتەواوی وەك یەکێك لەو تاڤگانە وایە کە لە لوتکەی چیاکانی کوردستانەوە بەرەو دۆڵ و پێدەشتەکان بەخوڕ دێتەخوارەوە. لە بەشی داهاتووی زنجیرەی

بیرەوەرییەکانی سەرۆکی عیراقدا، تاڵەبانی دەمانباتەوە بۆ ڕۆژانی سەرەتای خوێندنگە دواناوەندییەکەی لە هەولێر و پاشان لە کەرکوك کە بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا زیندانی کراوە.

وێستگە یاخود قۆناغی یەکەمی هەولێر لە ژیانی جەلال تاڵەبانیدا بە یەکێك لە گرنگترین قۆناغەکانی مێژووی ژیانی دادەنرێت، لە ساڵی 1950 تاڵەبانی خوێندنی ناوەندیی بە سەرکەوتوویی تەواوکرد و دەبووایە خوێندنی دواناوەندیی لە هەولێر تەواو بکات لەبەرئەوەی لە شاری کۆیە خوێندنگەیەکی دواناوەندیی لێ نەبوو، ئەمەش یەکەمجار بوو کوڕی بنەماڵەی تاڵەبانی کە سەرەڕای بچووکی تەمەنی وەك کەسایەتییەك لە کەسایەتییەکانی کۆیە ناسرابوو، لە ماڵی خێزانەکەی و کۆڵان و شەقام و بازاڕەکانی شارەکە کە خۆشی دەویستن، دووربکەوێتەوە بەرەو دەوروبەری شارێکی گەورەتر کە هەولێر بوو.

نەك تەنیا هەر ئەوە، بەڵکو کاروبارەکان بۆ خوێندکارێکی پۆلی چوارەمی دواناوەندیی ئەو کاتە بەو کارانە دەپێورا کە بۆ کێشەی کورد و عیراق پێشکەشی دەکردن، هەولێریش کۆیە نییە، ئەگەرچی ئەویش شارێکی کوردییە، بەڵام ئەم شارەیان سەنتەری کوردستانە و دواتریش بووە پایتەختی هەرێمی کوردستان.

تاڵەبانی دەڵێت: «لە هەولێر پلەی حزبیم لە ئەندامی لیژنەی ناوچەوە بەرزکرایەوە بۆ ئەندامی لقی پارتی دیموکراتی کورد و لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی هەولێر»، دەبێت ئەوە بهێنینە پێش چاوی خۆمان کە چۆن کوڕێکی تەمەن حەڤدە ساڵان دەبێتە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی ناوەندی پارێزگایەك و لەپاڵ چەند ناوێکی گەورەدا لە ڕووی تەمەن و ئەزموونی خەباتیانەوە، ڕێبەرایەتی ئەم ڕێکخستنانە دەکات، بەڵام ئەم کوڕە گوێی بەم پرسیارانە نەدا و هەڵوەستەی لەسەر نەکردن، ئەو تەنیا ئەوە دەزانێت کە کار بۆ گەلەکەی و کێشەکەی بکات لەڕێی حزبەکەیەوە، خۆیشی بە تەواوی ئەمە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: «ڕێکخستنەکانی حزب لە هەولێر لە ئاستی داخوازییەکانی حزب و

داخوازییەکانماندا نەبوون، لەبەرئەوە لیژنەیەکمان بۆ بوژاندنەوەی ڕێکخستن پێکهێنا، هەروەك لیژنەیەکی ناوچەی نوێمان پێکهێنا، چونکە ڕەوشی ڕێکخستنی (پارتی) لەم شارەدا لاواز بوو، لیژنەکە هەریەکە لە نوری شاوەیس و میرزا عەبدولکەریم و بەندەی تێدابوو، وەك لیژنەی ناوچە پێکەوە کارمان دەکرد، ماوەیەك حەیدەر محەمەد ئەمین یشمان لەگەڵدا بوو کە خەڵکی هەولێرە، کارمان دەستپێکرد بۆ فراوانکردنی بنکەی حزب لەم شارەدا، لە هەمانکاتدا لە لیژنەی لیوا (پارێزگا)شدا کارم دەکرد».

ئەو کەسەی حزبی بەڕێوەدەبرد و ئاڕاستەی دەکرد هەمزە عەبدوڵلا بوو، کە پارێزەرێکی ناسراوە، چونکە سەرۆك بارزانی لە مۆسکۆ بوو، هەمزە عەبدوڵلاش ئەندامی دامەزرێنەر بوو لە حزبدا و لە هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی ڕۆشنبیرتر و خەباتیشی زیاتر بوو، بەڕەسمیش وەکیلی سەرۆکی حزب بوو، لەبەرئەوەش هەر ئەوبوو ڕێبەرایەتیی حزبی دەکرد بە پشتبەستن بە مێژووییەکی سیاسی کە بۆ سالانی سییەکان دەگەڕایەوە، چونکە ئەندام بوو لە ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی حزبی شیوعی عیراقدا، لەبەر گرنگی و کاریگەرییە سیاسییەکەشی، حکومەتی عیراق سەرپشکی کردبوو لە نێوان ئەوەی بە دادوەر یاخود بەڕێوەبەری ناحیە دابمەزرێت، یان ڕەگەزنامەی عیراقی لێدەسەنرێتەوە، بۆیە کارکردنی لەگەڵ حکومەت ڕەتکردەوە و پەنای بۆ خۆشاردنەوە برد و لە ساڵی 1937وە خۆی شاردبووەوە و جەماوەرێکی بەرفراوانیشی هەبوو.

هەموو ڕێگای کاری حزبیی لەبەردەم مام جەلالدا تەخت نەبوو، دەبوایە ئەزموونێکی هەبێت ببێتە سەنگی مەحەك و بیگوازێتەوە بۆ پلەیەکی دیکە لە کاری سیاسیی ئەزمووندار، ئەم ئەزموونەش

له هاوینی 1951دا هاتەئاراوە کە تاڵەبانی باسی دەکات و دەڵێت:
«له پۆلی چوارەمەوە دەرچووبووم بۆ پێنجەمی دواناوەندیی، لەبری ئەوەی بەپشوویەك شاد بم ئەگەرچی کورتیش بێت و تێیدا سەردانی خێزانەکەم بکەم لە کۆیە، کەچی بۆ ماوەی سێ مانگ لەگەڵ حەوت سەرکردەی پارتی دیموکراتی کورددا دەستگیرکرام و نەفی کراین بۆ شاری موسڵ و لە بەندکردنماندا دووچاری هیچ جۆرە ئەشکەنجە یان سووکایەتییەك نەبووینەوە».

تا چەند تەنیا بەندکردن لەنێو چوار دیواردا، بۆ کوڕێك کە هێشتا نەگەیشتبێتە تەمەنی هەژدەساڵی، سەختە، ئەوا بۆ تاڵەبانی مانای ئەزموونێکی جددی بوو کە بووە مایەی شانازی لە ناخیدا، چونکە ئەو زیندانی سیاسی بوو لەگەڵ حەوت کەس لە گەورە سەرکردەکانی حزبەکەی کە لە گرنگیدا وەك ئەوانی لێهاتبوو، پاشان ئەم ئەزموونە یەکێکی دیکەی بەدوادا هات کە سەرنجڕاکێشتر بوو، ئەویش نەفیکردن بوو بۆ شاری موسڵ کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی عەرەبن، ئەگەرچی ژمارەیەکی زۆر کوردیشی تێدابوو، لەو بارەیەوە تاڵەبانی دەڵێت: «چووین بۆ موسڵ و چەند ژوورێکمان لە ئوتێلێکی میللیدا گرت، خۆمان خواردنمان دروستدەکرد، دەبووایە حکومەت ڕۆژانە بڕی سەد فلس بداتە هەر یەکێکمان، کە مافی نەفیکردن بوو، زیاتر لە مانگێك تێپەڕی بەبێ ئەوەی حکومەت یەك فلسمان بداتێ، لەلایەن خێزانەکانمانەوە پارەمەتیمان وەردەگرت، بۆیە چووین بۆ لای موتەسەریف (پارێزگار) کە ئەو کاتە سەعید قەزاز بوو بۆ ئەوەی سکاڵای لەلا بکەین، فەڕاشی موتەسەریف کوردێکی هەژاربوو، ڕێگەی نەداین بچینە ژوورەوە و وتی موتەسەریف لە کۆبوونەوەدایە لەگەڵ باڵیۆزی تورکیا، لە نەفیکراوەکان قادری حاجی حسێن-مان لەگەڵدا بوو کە نانەوابوو لە سلێمانی، بە

فەڕاشەکەی موتەسەریفی وت: بڕۆ بەموتەسەریف بڵێ باڵیۆزی کوردستان لێرەیە و دەیەوێت هەر ئێستا بیبینێت. فەڕاشەکەش ئەم قسەیەی بە جددی وەرگرت و چووە ژوورەوە بۆ لای موتەسەریف و پێیڕاگەیاند کە باڵیۆزی کوردستان لەوێیە و دەیەوێت بیبینێت و وەفدێکیشی لەگەڵدایە، هەر کە باڵیۆزی تورکیا هاتە دەرەوە ڕێگەی پێداین بچینە ژوورەوە و قەزازی موتەسەریف بە گەرمی پێشوازی لێکردین و داوای لێکردین دابنیشین، پاشان بە گاڵتەوە پرسی کە باڵیۆزی کوردستان کێیە، قادری حاجی حسێنیش وەڵامی دایەوە: (من).. موتەسەریفیش لێیپرسی، تۆ کێیت؟ قادری حاجی حسێنیش لە وەڵامدا وتی: (ئەو نانەواخانەیەت لەیاد نییە کە لە نزیك ماڵەکەتان بوو؟) موتەسەریفیش پێکەنی و وتی تۆ قادری حاجی حسێنی نانەوایت و زۆر بەخێرهاتنی کرد، ئیتر دەستیکرد بەقسەکردن لەگەڵمان و لە عومەر دەبابەی پرسی و وتی: (چیمان لێدەکەن ئەگەر حوکم بگرنەدەست؟) عومەر دەبابەیش وەڵامی دایەوە: دەتاندەینە دادگای گەل. قەزازیش پێیوت: ئێوە دەتانەوێت شتێکی مەحاڵ بکەن، چۆن خەیاتێك دەتوانێت پارچەکانی دیاربەکر بە سلێمانییەوە ببەستێتەوە؟ ئەم کێشەیە دۆڕاوە، گوێ لە ئامۆژگاری من بگرن و لە بواری ڕووناکبیریدا کاربکەن بۆ گەشەپێدانی وڵات و گەلەکەتان، چونکە کێشەی کورد کێشەیەکی دۆڕاوە، ئەگەر ئومێدێك هەبووایە منیش کارم لەگەڵ دەکردن، حکومەتیش هەڵەیکردووە کە بەندیکردوون و نەفیکردوون بۆ ئێرە، پاشان پەیوەندیکرد بە بەڕێوەبەری پۆلیسەوە و داوای لێکرد دەستبەجێ و لەسەر بەرپرسیارێتی خۆی ماڤ دوومانگمان بداتێ، ئێمەش سوپاسمانکرد و چووینەدەرەوە بۆ ئەوەی حەقی خۆمان وەربگرین کە بڕێك پارەی باش بوو لەو کاتەدا».

مام جەلال بەردەوام دەبێت لەسەر وەسفکردنی ئەزموونی نەفیکردنیان بۆ موسڵ و دەڵێت: «لە موسڵ بەندکراو نەبووین، بەڵکو نەفیکراو بووین، دەبووایە ڕۆژانە لەو فەرمانگەیەی پۆلیس کە نزیك بوو لێمانەوە، ناومان تۆمار بکەین، شەوان دەچووین بۆ لای ڕۆژهەڵاتی کەناری ڕووباری دیجلە کە موسڵی دەکرد بە دوو بەشەوە، بەشی ڕۆژهەڵات و بەشی ڕۆژئاوا، چونکە شارەکە لەلای ڕۆژئاوایەوە ئاوەدان بوو، بەڵام لەلای ڕۆژهەڵاتیەوە ماڵ و شارستانی تێدا نەبوو، بەڵکو تەنیا لە کەناری ڕووبارەکە چایخانەی تێدابوو، ئێمەیش لەم چایخانانەدا دادەنیشتین و شوتیمان دەخوارد، ڕێگەمان پێنەدەدرا شارەکە جێبهێڵین لەبەرئەوە نامەمان بۆ دەهات چ لە کەسوکارمانەوە چ لە ڕێکخستنەوە، ئەویش لەڕێی ئەو کەسانەوە کە دەهاتن بۆ موسڵ»، بەڵام ئەو دەسەڵاتە قەزاییەی فەرمانی دابوو بە نەفیکردنی ئەو هەشت سەرکردەیە بۆ موسڵ، دوای دوومانگ بڕیاریدا کە ئەو بڕیارەی نایاساییە، تاڵەبانی سەبارەت بەوە دەڵێت: «دوای دوو مانگ دادگای پێداچوونەوە بڕیاریدا کە بڕیاری نەفیکردنەکە نایاساییە، چونکە هیچ بەڵگەیەك لە ئارادانییە جگە لە گومان، گومانیش لەڕووی یاساییەوە بۆ بەرژەوەندی تۆمەتبار لێکدەدرێتەوە، بەم جۆرە بەسەرکەوتوویی و دڵخۆشییەوە گەڕاینەوە بۆ کۆیە، چونکە مایەی سەربەرزی بوو کە کەسێك لەبەر هۆکاری سیاسی زیندانی بکرایە، بەلای منەوە ئەمە مانای ئەوەبوو کە بوومەتە سیاسەتمەدارێکی ناسراو لەلای هاوکارەکانم، بەبۆنەی گەڕانەوەشمان بۆ لای کەسوکارمان ئاهەنگ سازکرا».

مام جەلال ئاماژە بە هەست و سۆزی باوکی دەکات و دەڵێت: «باوکم هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم دوای تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ کار لە سیاسەتدا بکەم، نەك لە کاتی خوێندنی دواناوەندییدا، بەڵام لەلایەکی ترەوە شانازیشی بەوەوە دەکرد کە

کوڕەکەی خەباتگێڕێکە لەپێناوی کێشەیەکی نیشتمانیدا، لە کاتێکدا دایکم سووربوو لەسەر ئەوەی ببمە پیاوێکی ئایینی و لە تەکیەکە کاربکەم، بەڵام ئەوەم هەڵبژارد کە دەمویست و باوەڕم پێی هەبوو کە ئەویش کاری سیاسی و خەبات لەپێناوی کێشەی گەل و وڵاتەکەمدابوو».

وێستگە گرنگەکان لە مێژووی ئەم پیاوەدا بەدوای یەکدا دێن کە قەدەر ئەوەی بۆ ڕەخساند شارەزای ئەو ڕووداوە یەك لەدوای یەکانە بێت کە دەتوانن سەرکردەیەك لە جۆرێکی پێشکەوتوو دروست بکەن پشت بە ئەزموونەکان و زیرەکییە لەڕادەبەدەرکەی ببەستێت، بۆیە لە شوباتی 1951دا تاڵەبانی بەشداری لە کۆنگرەی دووەمی پارتی دیموکراتی کورد کرد کە بەشێوەیەکی نهێنی لە ماڵی عەلی حەمدی (دواتر کوژرا) لە بەغدا بەسترا، لەم کۆنگرەیەدا بڕیار درا ناوی حزبەکە لە «دیموکراتی کورد»ەوە بگۆڕدرێت بۆ «دیموکراتی کوردستان» و پەیڕەو و پرۆگرامە کۆنەکە هەڵبوەشێندرێتەوە و پەیڕەو و پرۆگرامێکی تازە بنووسرێتەوە. تاڵەبانی دەڵێت: «بیرۆکەی چەپڕەوانە بڵاوبوو لە پاڵ بیرۆکەی دیموکراتی میللیدا، پرسیاری ئەوەمان کرد کە چ جۆرە سیستمێکمان دەوێت؟، دیموکراتی پەرلەمانیی یاخود دیموکراتی میللی؟ بۆیە دیموکراتی میللیمان هەڵبژارد، چونکە دیموکراتی میللی لە چین و ئەوروپای ڕۆژهەڵات بڵاوبوو. پەیڕەو و پرۆگرامەکەش ماف چارەی خۆنووسینی گەلی کوردی بەشێوەی یەکێتیەکی خۆویستانە لەگەڵ عیراق دووپاتکردەوە، ئەمەش لەسەرەتاوە پەیڕەو و پرۆگراممان بوو کە عیراق فیدراڵی بێت و حکومەتێکی کوردی هەبێت شانبەشانی حکومەتێکی فیدراڵی، لە سایەی عیراقێکی کۆماری دیموکراتی میللیدا، کوردستانیش

هەرێمێك بێت لە چوارچێوەی ئەم عیراقەدا، هەروەها دروشمی دیموکراسی بۆ هەموو عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کورد گۆڕدرا بۆ دیموکراتی میللی بۆ عیراق و فیدراڵی بۆ کورد، هەموو ئەمانەش لە پەیڕەو و پرۆگرامی نوێی حزبدا جێگیرکران».

ئەمە یەکەم هەوڵی نوێبوونەوە یاخود چاکسازی بوو ئەگەر وەسفەکەمان ڕاست بێت، لە مێژووی ئەم حزبە کوردییەدا، چونکە ناوی حزب گۆڕدرا و پەیڕەو و پرۆگرامێکی نوێش نووسرایەوە، بەپێی قسەکانی مام جەلال ئیبراهیم ئەحمەد ئەم بیرۆکە نوێیانەی گواستەوە بۆ ناو حزب کە لە زینداندا بوو و جەلیل هۆشیار-یشی لەگەڵدا بوو، هەر کە یەکەمجار ناوی ئیبراهیم ئەحمەد لە قسەکانی تاڵەبانیدا هاتەپێشەوە هەست بەوە دەکەین ئەم پیاوەی زۆرکەوتووەتە بەردڵ کە دواتر لەڕووی فیکری و ژیانییەوە پەیوەستی بوو، لەڕووی فیکریەوە لە جیابوونەوە بەناوبانگەکەی ساڵی 1964 لە سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی، لەڕووی ژیانییشەوە لە پەیوەستبوونی تاڵەبانی بە خێزانی ئیبراهیم ئەحمەدەوە لەڕێی هاوسەرگیری لەگەڵ هێرۆخانی کچیەوە.

مام جەلال وەسفی ئەو گۆڕانکارییانە دەکات کە لەو کۆنگرەیەدا ڕوویاندا و دەڵێت: «ئیبراهیم ئەحمەد بە یەکێك لە مارکسیستەکان دادەنرێت، زمانی ئینگلیزی دەزانی و زۆر کتێبی مارکسی لە زینداندا دەخوێندەوە، کاتێکیش لە زیندان هاتە دەرەوە داوای بەستنی کۆنگرەی دووەمی حزبی کرد، خۆی هەڵنەبژێردرا، بەڵکو بە بانگهێشتێك ئامادەبوو و جەلیل هۆشیاری لەگەڵدا بوو، ناکۆکییەك لەناو حزبدا لە ئارادابوو کە هۆکارەکەی بڕیاری هەڵنەبژاردنەوەی سەرکردەکانی پێشووی حزب بوو لە

سەرکردایەتی نوێدا بەهۆی شکستهێنانی کۆمیتەی ناوەندی یەکەمی حزب لە ئەرکەکانیدا و زۆرێك لە ئەندامەکانی وازیان لە کاری سیاسی هێنابوو و تەنیا سێ چوار ئەندامیان مابوون، بەم جۆرە بڕیاردرا پێنج ئەندامی سەرکردایەتی نوێ هەڵبژێردرێن کە دارشتنی پەیرەو و پرۆگرامێکی نوێ بۆ حزب بگرنە ئەستۆ و داوای بەستنی کۆنگرەیەکی فراوانتری حزب بکەن کە تێیدا گۆڕینی ناوی حزب و پەیرەو و پرۆگرامە نوێیەکە پەسەند بکرێن».

لێرەدا گرنگترین وێستگەی ئەو کاتەی مێژووی سیاسیی و ژیانیی جەلال تاڵەبانی دێتە پێشەوە، باسی ئەم قۆناغەش دەکات و دەڵێت: «یەکێك بووم لەو پێنج ئەندامەی بۆ سەرکردایەتی حزب هەڵبژێردران، بەڵام داوای لێبووردنم کرد کە ئەو شوێنەم وەرنەگرت لەبەر بچووکی تەمەنم، تەنازولم کرد بۆ مامۆستا جەلیل هۆشیار کە لە دەنگداندا لەدوای ناوی منەوە هاتبوو، وتم مامۆستا هۆشیار پارێزەرە و ئێستا لە زیندان هاتۆتە دەرەوە و ئەزموونێکی لە کاری سیاسییدا هەیە، هەرواش بوو هۆشیار لەبری من دانرا، ئیبراهیم ئەحمەدیش بە سکرتێری حزب و جەلیل هۆشیار و نوری شاوەیس و بەکر ئیسماعیل و محەمەد ئەمین مەعروف وەك ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی جێگیرکران و کۆمیتەی ناوەندی بڕیاری دارشتنی پەیرەو و پرۆگرامی نوێی حزبی دا کە لە کانوونی دووەمی 1953 لەو کۆنگرەیەی بەنهێنی لە کەرکوك بەسترا، پەسەند کرا، پەیرەو و پرۆگرامەکە گیانێکی مارکسیانەی هەبوو، ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی و دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراتی میللی لە عیراق پەسەند کرد کە کورد حوکمێکی فیدراڵی هەبێت لە چوارچێوەی عیراقدا، هەروەها ناوی حزبیش گۆڕدرا بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان».

وەك پێشبینی دەكرا جەلال تاڵەبانی خوێندنی دواناوەندیی لە هەولێر تەواو نەكرد، چونكە ڕووداوی دەستگیركردنەكەی و نەفیكردنی بۆ موسڵ ڕێگربوو لەبەردەم مانەوەی لە دواناوەندیی هەولێر هەرچەندە لە خوێندندا سەركەوتوو بوو و لە ئەنجامدانی تاقیكردنەوەی كۆتایی پۆلی چوارەمی دواناوەندیی بەخشرابوو، چونكە زیاتر لە (90٪)ی لە تاقیكردنەوە وەزرییەكاندا بەدەستهێنابوو. بەڕێوەبەری قوتابخانەكان لەو سەردەمەدا خۆیان لە كێشە بەدوور دەگرت، بەتایبەتی كێشەی سیاسی، بۆ خۆلادان لە كێشە و كاركردن بەو پەندەی میللیەی دەڵێت: «ئەو دەرگایەی بای لێوە دێت، دایخەوە و ئیسراحەت بكە»، ئەوا بەڕێوەبەری دواناوەندیی هەولێر بەباشیزانی تاڵەبانی بگوازێتەوە بۆ قوتابخانەیەكی دیكە، تاڵەبانی باسی ئەم ڕووداوە دەكات و دەڵێت: «دواناوەندییم لە كەركوك تەواوكرد، ئەویش لەبەرئەوەی بەڕێوەبەری دواناوەندیی لە هەولێر حەزی نەدەكرد لە قوتابخانەكەیدابم بۆ ئەوەی خۆی لە كێشە لابدات، لە هەمانكاتدا نەیویست ئیحراجم بكات وەك ڕێزگرتنێك بۆ پەیوەندیی لەگەڵ باوكم، بۆیە پێشنیاری گواستنەوەمی بۆ كەركوك كرد، منیش ڕازیبووم».

مەسەلەی گواستنەوەی بۆ كەركوك ڕێگر نەبوو چ لە ڕێگای خوێندنەكەی یاخود كاری حزبیدا، بەڵكو ئەوە مایەی شانازی بوو بۆی لەلایەك لەبەرئەوەی سیاسەتمەدارێك بوو ئاماژەی بۆدەكرا، لەلایەكی تریشەوە ئەو هاتوچۆیانەی دەبوونە هۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی لەڕووی حزبییەوە و تۆڕی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانیشی زیاتر دەكرد.

لە كەركوك مام جەلال بەرپرسیارێتی حزبی نوێ و ئەركی قورستری لە یەكەمجار وەرگرت، بەڵام هەر پێی خۆشحاڵ بوو

سەرەڕای ئەو دەستگیرکردنانەی ڕاپێچی زیندانیانیشیان کرد، لەو بارەیەشەوە دەڵێت: «ساڵی خوێندنی 1951- 1952 دوا ساڵم بوو لە دواناوەندیی (پێنجەمی دواناوەندی)، لە کەرکوك لە لیژنەی ناوچەی پارتی دیموکراتی کوردستان کارمدەکرد، ڕۆژنامەیەکی حزبیی مانگانەی نهێنیمان دەردەکرد کە ناوی (ڕزگاری) بوو بە ئامێری ڕۆنیۆ چاپمان دەکرد، ئەرکی دابەشکردنی ڕۆژنامەکەم پێ سپێردرابوو بەسەر ڕێکخستنەکانماندا، هەر کە دەردەچوو دەهاتە ماڵی ئێمە و پاشان من دابەشم دەکرد بەسەر پەیامنێرە حزبییەکاندا کە دەگەیشتنە لامان. جارێکیان کەسێك دەستگیرکرا کە گواستنەوەی ڕۆژنامەکەی بۆ ناوچەی ڕانیە پێسپێردرابوو، کاتێك سەبارەت بە سەرچاوەی ئەو ڕۆژنامەیەی پێیبوو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرابوو، دانی بەوەدا نابوو کە لە جەلال حوسامەدین تاڵەبانی قوتابی دواناوەندیی کەرکوك وەریگرتووە، بۆیە فەرمانی دەستگیرکردنم دەرچوو، لە بەختی خۆم دادوەرەی لێکۆڵینەوە کەمال عومەر نەزمی، پیاوێکی دیموکراتخواز بوو و مەیلی چەپڕەوانە بوو، بۆیە کاتێك ناوی خوێندبوومەوە و زانیبووی من تاڵەبانییم پەیوەندی کردبوو بە خزمێکمانەوە کە پارێزەر ئیحسان تاڵەبانییە و لێیپرسیبوو کە دەمناسێت یان نا؟، ئەویش لە وەڵامدا وتبووی خزممە، لەبەرئەوە پێی ڕاگەیاندبوو کە فەرمانی دەستگیرکردنم دەرچووە و ئەو (دادوەری لێکۆڵینەوە) لەگەڵ موختار و پۆلیسدا دوای چەند سەعاتێکی کەم بەرەو ماڵەکەمان دەچن بۆ پشکنین و دەستگیرکردنم، بۆیە داوای لێکردبوو کە پێمڕابگەیەنێت ئەگەر شتێکی قەدەغەکراو، ڕۆژنامە یاخود بڵاوکراوە، لە ماڵەکەماندا هەیە بیشارمەوە یان لەناوی ببەم بۆ ئەوەی هیچ تۆمەتێکم بەسەردا ساغ نەبێتەوە، منیش چەند

دانەیەکی ڕۆژنامەکەم لەلابوو، بۆیە پارێزەرەکە بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بردنی و ڕۆیشت و هیچ شتێکی قەدەغەکراو یاخود شتێك کە گومان و تۆمەت دروستبکات لە ماڵەکەدا نەمایەوە، کاتێك دادوەری لێکۆڵینەوە لەگەڵ موختار و پۆلیس هاتن و ماڵەکە گەڕان هیچیان نەدۆزیەوە لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ خۆی بردمی و لە شوێنێکی تایبەت دایناوم نەك لەگەڵ بەندکراوەکانی دیکەدا».. ئەمەش دواجاربوو کە لە کەرکوك دەستگیربکرێت.

دەبێت ڕۆژی هەینی ڕۆژی پشووی سەرۆك تاڵەبانی بێت کە هیچ چالاکییەکی نووسینگەیی یاخود کۆبوونەوە ئەنجام نادات، بەڵام ئەو هیچ ڕۆژێکی هەفتە بەبێ کارکردن بەجێناهێڵێت، چونکە لە پشووی کۆتایی هەفتەدا بەتایبەتی کە لە شاری سلێمانیدا دەبێت، سەردانی گوند یاخود شارۆچکەکانی کوردستان دەکات، چاوی بە هاوڵاتیانی و دۆستان و هەڤاڵانی خەباتی چەکداریی شاخ دەکەوێت، زۆرجاریش هەندێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بانگدەکات بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی بکەن لەم گەشتانەدا و هێرۆخانی هاوسەریشی لەگەڵ خۆی دەبات کە ئەویش دەرفەتی گونجاوی نییە بۆ بینینی مێردە هەمیشە سەرقاڵەکەی.

دەچێتە گوندەکان و لەگەڵ خەڵکەکەیان دادەنیشێت، پیر و ژن و منداڵ و پیاو، قسەیان لەگەڵ دەکات نەك بەوپێیەی سەرۆك کۆماری عیراقە، نەك وەك سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش، بەڵکو تەنیا لەبەرئەوەی مام جەلال ـە، ئەوانیش لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، بۆیە دەبینیت بە سادەیی پێشوازی لێدەکەن و وەك یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکانیان قسەی لەگەڵ دەکەن، بەبێ ئەوەی ئەندامانی تیمی

پاسەوانانی یاخود ئەندامانی سکرتاریەتەکەی ڕێ لە هیچ هاوڵاتییەك بگرن کە بیەوێت سڵاوی لێبکات یان قسەی لەگەڵدا بکات یاخود بیەوێت وێنەیەکی یادگاری لەگەڵ بگرێت.

دوو ڕۆژ بەر لە ئەنجامدانی دیداری تایبەت بەم گفتوگۆیەی لەم بەشەدا بڵاوکراوەتەوە، لە هاوینەهەواری دوکان بووم، ڕۆژی هەینی بوو، کاك کامیل کە یەکێکە لە ئەندامانی سکرتاریەتەکەی لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ئەوەی سبەینێ لەگەڵ مام جەلال بەسەردان بچینەی ناوچەیەکی دەوروبەری سلێمانی، چەندین ناوچەمان بڕی کە پڕبوون لە گوڵی زەرد و سوور، پێدەشتی سەوزی ڕازاوە بە سەدان ڕەنگ، لە چەند ڕووبارێك پەڕینەوە کە ئاوە ڕوونەکەیان بەخوڕ دەڕۆشت، بەدرێژایی ڕێگاکەش بە سەدان خێزانی لێبوو هاتبوونە دەرەوە بۆ نێو شاخەکان، کە ئەمەش نەریتێکی کوردییە، چونکە ڕۆژانی هەینی هیچ خێزانێك لەماڵەوە نامێنێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر ئاسمان ساماڵ بێت. دەچنە درەوە بۆ دەشت و دەر، هەڵدەپەڕن و گۆرانی دەچڕن و لەناخەوە دڵشاد دەبن، مام جەلالیش لە هەرکوێیەکەوە بڕوات دەوەستێت بۆ ئەوەی سڵاو لە خێزانەکان بکات و بیاندوێنێت و لەگەڵیان پێبکەنێت، سەرمەست بێت بە دڵخۆشییە ڕوحییەکەیان. گەیشتینە شوێنێك لە سەیرانگا دەچوو، تاڤگەی ئاو لە لوتکەی شاخەکەوە دەهاتە خوارەوە، کەپرێك بۆ پێشوازی مام جەلال و میوانەکانی ئامادەکرابوو کە مەیل و ئینتیما و تەمەنیشیان جیاوازبوو، هەر کە دانیشتین بۆی ڕوونکردمەوە و وتی: "ئەم ناوچەیە ناوی (چەمی ڕەزانە) و یەکەم بنکەی تاڵەبانی بووە لە ساڵی 1961دا بۆ بەرگریکردن لە کوردستان لەدژی هێزەکانی حکومەت، ئەمڕۆش لەسەر داوای یەکێك لە پێشمەرگەکان کە دواتر شەهیدبوو، بووەتە سەیرانگا،

کاتێك داوای لە سەرکردە و هەڤاڵی خۆی مام جەلال کرد ئەم شوێنە بکرێتە سەیرانگای خەڵك لەبەر جوانی سروشتەکەی، ئەو داوایەشی جێبەجێ بوو سەیرانگاکە ناوی ئەو پێشمەرگە شەهیدەی لێنرا. لەم بەشەدا سەرۆکی عیراق باسی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد دەکات لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا.

ئاواتەکەی جەلال تاڵەبانی بۆ بینینی مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی حزبەکەی، لەناخیدا زیندووبوو، ئەویش لەبەرئەوەبوو کە بارزانی وەك لە ئەڵقەی پێشووتردا ڕوونمانکردەوە، تەنیا سەرکردەی حزبێکی کوردی نەبوو، بەڵکو سونبولی ڕزگاریخوازی شۆڕشگێڕانەی نیشتمانی و داکۆکیکاری مافەکانی گەلی کورد و یەکێك لە کۆڵەگەکانی دەوڵەتی مەهابادی کوردیش بوو، ئەم دەوڵەتە یاخود ئەم کۆماری مەهابادەش ئەگەرچی بەردەوام نەبوو، بەڵام بە ڕەمزێکی ئاواتەکانی کورد دەمێنێتەوە لەوەی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان هەبێت.

تاڵەبانی هێشتا ئەو وشە نهێنییەی لەیاد ماوە کە وەك ئەو وشە جادوییە وایە دەرگای لە بەردەمدا کردەوە بۆ بینینی بارزانی سەرکردەی، جێبەجێبوونی ئەم ئاواتەش بۆ دووساڵ دواکەت تا مام جەلال بەوپێیەی سکرتێری گشتی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بوو، بانگهێشتکرا بۆ ئامادەبوون لە میهرەجانی لاوان و قوتابیانی جیهان لە مۆسکۆ لە ساڵی 1957دا وەك بەشێك لە وەفدی عیراق، نیمچە یەقینێك لە ناخی تاڵەبانیدا هەبوو کە ئەمجارە چاوی بە بارزانی دەکەوێت.

تاڵەبانی دەڵێت: «بەر لەوەی بگەمە مۆسکۆ بۆ بەشداریکردن لە میهرەجانی لاوانی جیهان لە ساڵی 1957دا، سەبارەت بە سەردانەکەم بۆ پایتەختی یەکێتیی سۆڤێت و خواستم بۆ بینیی

بۆ بارزانیم نووسیبوو، لەڕێی ئەو کەسە ئێرانیەوە نامەم بۆ نووسی کە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بوو، هەروەك هێشتا ئەو وشە نهێنیەم لەیادە کە لە ساڵی 1955دا نەجەفی لە بارزانیەوە بۆی هێنام».

مام جەلال ڕووداوێکی خۆش دەگێڕێتەوە سەبارەت بە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەو کوردە عیراقیانەی لە مۆسکۆ بوون و دەڵێت: «لە ڕۆژی یەکەمی گەیشتنمان بۆ مۆسکۆ لە وێستگەی شەمەندۆفێر چەند کوردێکی سۆڤێت پێشوازییان لێکردین، چونکە لەڕێی جلوبەرگە کوردییە دیارەکەمانەوە ناسیبوویانینەوە، بێگومان لە چوارچێوەی وەفدی عیراقدا بووین، پاشان هەریەك لە دکتۆر عەبدولعەزیز شەمزینی و دکتۆر موراد ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان هاتن بەوپێیەی ئەوانیش کوردی سۆڤێت بوون، ئەویش لەبەر هۆکاری ئەمنی، هەردووکیان دوای ئەوە هاتن کە زانییان کوردی عیراق لەنێو وەفدەکەی عیراقدان، شێخ عەلی نەقشبەندی-مان لەگەڵدابوو کە لە چوارچێوەی وەفدی حزبی شیوعی عیراقدا هاتبوو، شەمزینی بەباشی دەناسی، بۆیە بردمیە لایەکەوە و پێیوتم مام جەلال ئەمە عەبدولعەزیز شەمزینییە و من بەباشی دەیناسم، چونکە لە عیراق ئەفسەربوو باوکم پەیوەندی لەگەڵدا هەبوو منیش خۆی دەناسم، بۆیە بەرەو ڕووی شەمزینی چووم و سڵاوم لێکرد بەوپێیەی عەبدولعەزیزە و پێموت: سڵاوت لێبێت دکتۆر عەزیز، ئەویش سەرەتا نکوڵی لەوەکرد کە عەبدولعەزیز بێت و وتی: من عەبدولعەزیز نیم، منیش پێموت: بۆچی خۆتمان لێ هەڵەدەکەیت ئێمەیش کوردین و لە یەك حزبین و دەمانەوێت چاومان بە ئێوە و بارزانی بکەوێت؟ ئینجا نەقشبەندینم بانگکرد کە بەگەرمی

سلاوی لێکرد و پێیوت: لە فلانە چاپخانە لە بەغدا یەکترمان دەبینی، ئەویش زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: بەڵێ بەخوا من عەبدولعەزیزم و بەخێربێن، بەلام لە درێژەی قسەکانیدا وتی: مەلا مستەفا بارزانی ناتوانێت بتانبینێت بە ڕەزامەندی سۆڤێت نەبێت.

بەلام مام جەلال بێ ئومێد نەبوو، بەجیددی کاری بۆ بینینی سەرکردەی حزبەکەی دەکرد و دەڵێت: «دیدارەکانمان لەگەڵ شەمزینی دووبارە بووەوە، لە یەکێك لە دیدارەکاندا پێیوتم مەلا مستەفا بارزانی دەیەوێت بتبینێت، بەلام نازانم کەی، بۆیە دەبێت لێرە دابنیشیت، شوێنێکیشی لەبەردەم ئەو بینایەی تێیدا نیشتەجێبووم بۆ دەستنیشانکردم، لە کاتێکی دیاریکراوی هەموو ڕۆژێکدا تێیدا بووەستم تا کەسێك دێت دەمبات بۆلای، بەمجۆرە لەسەر کورسییەك لەبەردەم بیناکە دادەنیشتم چاوەڕوانی کەسێکم دەکرد بێت و بمبات بۆ بینینی بارزانی، ڕۆژێکیان دووکەس هاتن کە سیمای کوردانەیانم ناسیەوە، لێم نزیکبوونەوە و بە هێمنی سلاویان لێکردم و یەکێکیان لێیپرسیم کە ئایا لەگەڵ وەفدەکەی عیراقم، منیش وتم: بەڵێ، ئەویش وتی: ئێمە بەدوای هاوڕێیەکماندا دەگەڕێین، ئەگەر بکرێت یارمەتیمان بدەیت تا بیبینین، وتم: بفەرموون، بەدوای کێدا دەگەڕێن؟ ئەوانیش وتیان: بەدوای جەلال تاڵەبانیدا دەگەڕێین، منیش وتم: من جەلال-م، بەلام ئەوان دڵنیانەبوون لەوە، بۆیە منیش وتم: ئێوە بارزانیین وانییە؟ یەکێکیشیانم دەناسی کە ئەسعەد خۆشەوی بوو و یەکێك بوو لە سەرکردە بارزانییە ناسراوەکان، پاشان پرسیاری ئەو وشە نهێنییەی لێکردم کە نەجەف پێیوتبووم، منیش وشەکەم پێوت، ئەویش وتی: بەڵێ تۆ جەلال تاڵەبانی-یت، خۆشەوی وتی: مەلا

مستەفا دەیەوێت بتبینێت بۆیە وەرە لەگەڵمان، وتم: باشە و زۆر دڵخۆشبووم».

مام جەلال بەدڵخۆشییەکی زۆرەوە وردەکاری ئەم دیدارە وەسف دەکات، دەیهێنێتەوە یادی هەر وەك ئەوەی ئێستا ڕووی دابێت، زەردەخەنەیەك چووە سەر ڕووخساری و تروسکاییەك لە چاوانیدا دەرکەوت و دەستیکرد بە قسەکردن و ئامادەی دەکردم بۆ ڕووداوێکی زۆر گرنگ و وتی: «ئەو کاتە تەمەنم 24 ساڵ بوو، ڕوومانکردە ئەو باڵەخانەیەی بارزانی تێدا نیشتەجێبوو، بە ئەسانسۆر سەرکەوتین بەبێ ئەوەی سەرنجی ئەوە بدەم لە چ نهۆمێکدا بوو، یەکێك لە هاوەڵەکان زەنگی لێدا، شتێکی لەناکاوبوو بۆمن کە مەلا مستەفا بارزانی خۆی دەرگاکەی کردەوە، سڵاوم لێکرد، ئینجا باوەشی پێداکردم، لە خۆشیاندا لە هۆش چووم». لێرەدا دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوانی سەرۆك تاڵەبانی هاتنەخوارەوە، سڕینی و کەمێك چاویلکەکەی لادا، کەمێك هێمن بووەوە و هاتەوە سەرخۆی، پاشان وتی: «ئەوە لەبەرئەوەیە کە بارزانی بەلای منەوە ڕەمزێکی گەورە و ئەفسانەیەکە لە خەباتی کورددا، ئاگاداری ئەو نامەیە بوو کە بۆم ناردبوو بەوەی کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیم لە حزبدا، دانیشتین قسەمان کرد، ئەم دیدارە دیداری دیکەی بەدوادا هات، چونکە بە کەمی هەواڵی ئێمەی پێدەگەیشت، لەبارەی حزب و ڕەوشی کورد و کێشەی کورد لە عیراق و سۆڤێت چۆن دەڕوانێتە کێشەی کورد و دەبێت چی بکەین قسەمانکرد، ئەم جۆرە قسانەش بۆ وڵات و گەلەکەمان و کێشەکەمان گرنگن».

دوو ساڵ دوای ئەو دیدارە، واتە لە ساڵی 1959دا مەلا مستەفای بارزانی لە ڕێی دەریاوە گەڕایەوە بۆ عیراق و گەیشتە بەسرە. کاتێکیش گەیشتەجێ کەشتییەکی حکومی کە ناوی (تەمموز) بوو، کەشتییەکی شاهانە بوو بۆ بنەماڵەی پاشا تەرخانکرابوو، لە بەندەری فاوەوە گواستیەوە بۆ بەندەری مەعقەل.

بە تەمەنەکانی خەڵکی بەسرە باسی پێشوازیلێکردنی دەکەن کە خەڵکی بەسرە و عیراقییەکان لە کورد و عەرەب گەیشتوونەتە عەششاری ناوەندی بەسرە و ژمارەیان گەیشتۆتە سەدان هەزار، لە کەنارەکانی شەتولعەرەب قەرەباڵغییان دروستکردووە و تەنانەت بەشێکیان کەوتوونەتە ڕووبارەکەوە و خنکاون. هەروەها بەتەمەنەکانی خەڵکی بەسرە ڕووداوەکانی شارەکەیان لەسەر بنەمای مێژووی گەیشتنی بارزانی بۆ شارەکەیان نووسیوەتەوە، بۆیە بۆ نموونە دەڵێن ئەو ڕووداوە بەر لە گەیشتنی بارزانی بووە یاخود دوای گەیشتنی بارزانی ئیتر بەم شێوەیە.

ئەوکاتە کەسی یەکەم لە پارتی دیموکراتی کوردستاندا ئیبراهیم ئەحمەد بووە، ئینجا هەمزە عەبدوڵڵا و نوری شاوەیس و عەلی عەبدوڵڵا و عومەر مستەفا دەبابە، جەلال تاڵەبانیش لە پلەدا لەدوای ئەوانەوە هاتووە لە حزبدا.

تاڵەبانی دەڵێت: «لە ساڵی 1959دا لە کۆلێجی حقوق دەرچووم و ناوم لە سەندیکای پارێزەران تۆمارکرد، بەپێی یاساکانی عیراقیش کە ئەو کاتە کاریان پێدەکرا، دەرچووانی زانکۆکان دەبووایە لە سوپای عیراقدا خزمەت بکەن، لەبەر ئەوە چوومە کۆلێجی ئیحتیات بە ئەفسەری ئیحتیات

دەرچووم، ناردیانم بۆ ئەوەی ببمە مامۆستای یاسا لە کۆلێجی سەربازی، بەڵام من واسیتەمکرد بۆ ئەوەی لەدەست کۆلێجی سەربازی ڕزگارم بێت و لە قوتابخانەی زرێپۆش لە سەربازگەی ئەبو غرێب تەنسیبکرام بۆ ئەوەی بچمە خولی زرێپۆش بۆ ماوەی سێ مانگ کە تێیدا مەشقمان پێکرا لەسەر لێخوڕینی تانك و پەیوەندی و ئامادەکاریی و شەڕی زرێپۆش، پاش ئەوەی لە خولەکەش تەواوبووم لە کەتیبەی زرێپۆشی چوارەم لە ئەبوغرێب تەنسیبکرام کە بە تانکی (تی 54)ی سۆڤێتی هاوچەرخ تەیارکرابوو کە تازە گەیشتبوونە عیراق، بە ئەفسەریی لەم کەتیبەیەدا بۆ ماوەی شەش مانگ مامەوە، کە ئەو کاتە پارتی دیموکراتی کوردستان بە ڕەسمی مۆڵەتی پێدرابوو، پاشان مەلا مستەفای بارزانی داوای لە عەبدولکەریم قاسم کرد لەو ماوەیەی کە لە خزمەتی سەربازی ماومە خۆشبن و هەرواش بوو و بە پارێزەریی گەڕامەوە».

تاڵەبانی وتی: «عەبدولکەریم قاسم لەسەرەتادا زۆر خۆشەویست بوو، بەتایبەتی لە دوو ساڵی یەکەمی شۆڕشی 14ی تەمموزی 1958دا، بەو پێیەی عیراقی لە ئیستیعمار و حوکمی پادشایەتی ڕزگارکرد، پاش ئەوەش مادەی سێ لەو دەستوورەی لە سەردەمی ئەودا دەرچوو تێیدا هاتبوو کە عەرەب و کورد هاوبەشن لەم نیشتمانەدا، ئەم دەستوورە دانی بە مافە نەتەوایەتییەکانیان دا ناوە لە چوارچێوەی یەکێتیی عیراقدا، ئەم مادەیە مانای زۆر بوو بۆ کورد، هەر لە سەردەمی ئەودا مۆڵەت درا بە دەرچوونی ڕۆژنامەی حزب (خەبات) کە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە بەغدا و بە هەردوو

زمانی عەرەبی و کوردی دەردەچوو، بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری کوردیشی لە وەزارەتی مەعاریف دامەزراند و زمانی کوردی بەشێوەیەکی فراوانتر لە پێشوو دەخوێندرا و لە ئاڵای عیراقیشدا ڕەمزی بۆ کورد دانا، لەبەر ئەوە قاسم زۆر خۆشەویست بوو لەلای کورد». هەروەها تاڵەبانی دەڵێت: «کاتێك بارزانی دوای ساڵێك لە شۆڕش لە مۆسکۆ گەڕایەوە و لە بەغدا جێگیر بوو، قاسم خانوویەکی کۆنی لە خانووەکانی دامەزراوەی گشتیی هێڵی ئاسنی بۆ تەرخانکرد کە نوری سەعید سەرۆك وەزیرانی سەردەمی پاشایەتی تێیدا نیشتەجێبوو لە ناوچەی ساڵحیە (بەری کەرخ لە بەغدا) لە نزیك بینای ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، ئیتر بە ئاشکرا کاری سیاسیمان دەکرد تەنانەت بەر لە مۆڵەتپێدانی حزبیش لە ساڵی 1960دا، لق و بارەگامان لە زۆر شاری کوردی و عەرەبیدا کردەوە و حزب بەشێوەیەکی گەورە فراوان بوو، ڕێکخراوەکانی ژنان و کرێکاران و قوتابیان و لاوانیش بەشێوەیـــەکی بـــاشتر و نیمچەئاشکرا کاریان دەکرد».

هەرچەندە قاسم وەزیرێکی کوردی لە پارتی دیموکراتی کوردستان دانا بوو، بەڵام ئەو کارەی بەبێ هاوپەیمانێتی یاخود ڕێککەوتن لەگەڵ پارتی دیموکرات کردبوو، بەگوێرەی قسەکانی تاڵەبانی کە دەڵێت: «بەڕەسمی بەشداریمان لە حوکمدا نەکرد لەسەردەمی قاسمدا، بەڵام عەونی یوسف کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حزب بە وەزیری نیشتەجێکردن دانرا، بەڵام ئێمە وەك هاوپەیمانی لەگەڵ حکومەت بەشدار نەبووین و دامەزراندنی یوسف بەناوی حزبەوە نەبوو، قاسمیش داوای لێ نەکردین کە نوێنەرمان بۆ حکومەت

دەستنیشان بکەین وەك ئەوەی هاوپەیمان بین لەگەڵ حکومەت، بەڵام قاسم زۆری بەدڵ بوو و داینا، ئەمەش سەرکەوتنێك بوو بۆ ئێمە و بۆ کوردیش».

بەڵام ناکۆکییەکانی نێوان قاسم و بارزانی هەر زوو لە ڕووداوە سیاسییەکاندا سەریانهەڵدا، تاڵەبانی لەو بارەیەوە دەڵێت: «ئەمە چیرۆکێکی دوورودرێژە هێشتا کاتی نەهاتووە بیگێڕمەوە، ئەوەی ئەم ناکۆکییانەی قووڵکردەوە ئەوەبوو کە شۆڕشی تەمموز دەستیکرد بە لادان لە ڕێچکەکەی خۆی و کەسانی دیموکراتخواز و پێشکەوتنخوازی دووردەخستەوە و دژایەتی دەکردن، هەروەها کاردانەوەیەك هەبوو لە بۆچوونی قاسمدا لە ناوەڕاستی ساڵی 1959دا، بە دژایەتیکردنی حزبی شیوعی عیراق و پاشان حزبەکانی دیکە دەستیپێکرد، ڕۆژنامەی (الوطن الديمقراطي)ی سەر بە حزبی شیوعیش ڕەخنەی لەم هەڵسوکەوتانە دەگرت، ئەمەش بووەهۆی نیگەرانبوونی دەسەڵاتداران لەم ڕۆژنامەیە کە دایانە دادگای عورفی، بەڵام هۆکاری سێیەم ئەوەیە کە حکومەتی قاسم دەستیکرد بە چەکدارکردنی عەشایرە کورد و دواکەوتووەکان کە لەگەڵ ڕژێمی پێشوو (پاشایەتی) بوون و لە دژی بارزانییەکان هانی دەدان، ئەم هەنگاوەش بووە مایەی پاشەکشەکردن لە جێبەجێکردنی چاکسازی کشتوکاڵی کە یەکێك بوو لە ئامانجەکانی حزبەکەمان، هەروەها حکومەت وردە وردە لە مافەکانی کورد پاشگەزدەبووەوە تا ناکۆکییەکە قووڵبکاتەوە، ئەمەش گەیشتە ترۆپك کاتێك فرۆکەکانی حکومەت لە ساڵی 1961دا کۆمەڵگەکانی کوردیان لە دەربەندیخان و دەربەندی بازیان و زاخۆ و بارزان و گوندە

بارزانییەکان بۆردومانکرد، هەرچەندە بارزانییش لەو کاتەدا لە بارزان بوو، ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەك بوو بۆ دەستپێکردنی شەڕ و هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕشی کورد».

تاڵەبانیش بەشی خۆی هەبوو لە ناکۆکیی نێوان کورد و ئەو قاسمەی کە تۆمەتی دەدایە پاڵ بارزانی، مام جەلال دەڵێت: «لە جەژنی نەورۆزی ساڵی 1961دا لە بەغدا بووم، ئەندامی مەکتەبی سیاسی ڕاگەیەندراو بووم، عومەر دەبابەیش زیندانی بوو، لە کاتێکدا بارزانی لە بارزان بوو وەك پێشتر باسمانکرد، من بووم کە وتاری جەژنی نەورۆزم لە هۆڵی شەعب (لە بەری ڕەسافەی بەغدا بوو بەتەنیشت بینای وەزارەتی بەرگری کۆنەوە بوو کە قاسم کردبوویە بارەگای خۆی) پێشکەشکرد و لە وتارەکەدا ڕەخنەم لە قاسم گرت و بەرگریم لە بارزانی کرد کە قاسم تۆمەتباری کردبوو، هەروەك بەرگریم لە شۆڕشی کورد کرد و وتم: کاتێك گەلی کورد لە سەردەمی پاشایەتیدا لە دژی ئیستیعمار شۆڕشی دەکرد، کەسانێك هەبوون لەژێر فەرماندەیی جەنەڕاڵی بەریتانیا کاریان لەدژی شۆڕشی کورد دەکرد، مەبەستیشم لە قاسم خۆی بوو، پاشان لە ئاهەنگەکە چوومە دەرەوە و لە شوقەیەکدا لە بەغدا خۆم شاردەوە کە هی خۆمان بوو، ئیتر لەو ڕۆژەوە بە خۆشاردنەوەوە مامەوە تا چووم بۆ سلێمانی، چونکە دەمزانی کە دەستگیرم دەکەن، بەکردەوەش فەرمانی دەستگیرکردنم دەرچوو».

تاڵەبانی لە درێژەی قسەکانیدا وتی: «لە سلێمانی ڕێکخستنێکی بەهێز و کاریگەرمان هەبوو، منیش ئەندامێکی کارا و چالاك بووم لە مەکتەبی سیاسی و لە نزیکترین

ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بووم لە جەنەڕاڵ بارزانییەوە، بەر لە دەستپێکردنی شۆڕش لەو شوێنە هاتمەدەرەوە کە لە سلێمانی خۆم تێدا شاردبووەوە و چووم بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی دەسەڵاتمان تێیاندا هەبوو لە خەلەکان و شاخی هەیبە سوڵتان و دەربەندیخان و دەربەندی بازیان و لەو ناوچانەدا دەسووڕاینەوە».

دوور لە ناوەندی شاری سلێمانی، لە نێو دۆڵ و چیاکانیدا کە سروشتێکی بەخشندەی هەیە وەکو کورد کە هەموو کانیاو و تاڤگە و ڕووبار و کێڵگە و گوڵەکێوییەکانی دەبەخشێت، ئا لەوێدا و لە دامێنی دوو شاخی نزیك لە یەك ناوچەیەکی دڵڕفێنی تێدایە کە ناوی (چەمی ڕەزان)ە و مانای ئەو دۆڵەیە کە بارانی تێدا کۆدەبێتەوە، لە سەری شاخەکەوە تاڤگەیەك دێتە خوارەوە کە ناوی باڤڵ-ە، ئەویش ئەو ناوەیە کە تاڵەبانی لە کوڕی یەکەمی خۆی ناوە، چەمی ڕەزان پێشتر بەوە جیادەکرایەوە کە سەختە و بەزەحمەت دەیگەیتێ، هەروەها بە زۆری ئاوەکەی و ئەشکەوتە سروشتییەکانیشی، تاڵەبانی ئەم ناوچەیەی کردە بنکەی دەستپێکردنی چالاکییەکانی شەڕ پاش ئەوەی ئەرکی فەرماندەییکردنی ناوچەی سلێمانی و کەرکوکی خرایە ئەستۆ، تاڵەبانی دەڵێت: «یەکەم بنکەمان (چەمی ڕەزان) بوو، لە ناوچەی سلێمانی سێ گروپ بووین، یەکەمیان لە شاخی ماوەت بوو بە فەرماندەیی محەمەد حاجی تاهیر، دووەمیشیان لە دەربەندیخان بوو بە فەرماندەیی حیلمی شەریف، گروپی سێیەمیش بە فەرماندەیی من بوو لە چەمی ڕەزان، ئێمە لە بنکەکە 14 پێشمەرگە بووین، تەنیا چوارمان چەکدار بووین و 10

کەسەکەی تر بێ چەك بوون، بەڵام وردە وردە لە ڕووی ژمارەوە فراوان بووین و چەکمان دەستدەکەوت، چونکە پارەمان نەبوو چەك بکڕین هەروەك ئەو کاتە کەسێك نەبوو پشتیوانیمان بکات و چەکمان بۆ بنێرێت، بەڵکو دەستماندەگرت بەسەر مەخفەرەکانی پۆلیسدا و چەندە چەکییان تێدابووایە دەمانبردن، هەروەك ڕێکخستنیشمان هەبوو لەناو پۆلیسدا کە چەك و تەقەمەنییان دەگەیاندینێ، هەروەها خۆبەخشان لە سەرباز و پۆلیس هەڵدەهاتن و بەچەکەکانیانەوە دەهاتنە ڕیزەکانمانەوە، بەگشتی خۆپڕچەککردنمان سادە و ساکار بوو و لە تفەنگ زیاتر نەبوو، لە کاتێکدا حکومەت فڕۆکە و تۆپی لە دژمان بەکاردەهێنا».

مام جەلال هەڵوێستی شەڕ لە کاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: «لەو کاتەدا دوو هێزی کاریگەر هەبوون لە شۆڕشی کورددا، هێزێکیان بە فەرماندەیی جەنەڕاڵ بارزانی بوو لە ناوچەی بادینان و لە چەند سەد شۆڕشگێڕێك پێکدەهات و ئەوی دیکەیان لە چیای سەفین بوو بە فەرماندەیی عومەر دەبابە، پاشان ئەم هێزە کە لە 250 پێشمەرگە پێکدەهات لە سەفینەوە گواسترایەوە بۆ ناوچەی ڕانیە، هەرچی هێزەکەی ئێمەیشە ئەوا لە چەند پێشمەرگەیەکی کەم پێکدەهات، پاشان وەك باسمکرد وردە وردە فراوانبووین».

تاڵەبانی ئیعتیراف دەکات و دەڵێت: «حکومەت هیچ ئۆپەراسیۆنێکی لە دژمان ئەنجام نەدا لە چەمی ڕەزان، بەڵکو ئێمە گەڕمان پێدەکرد و چالاکیمان لەدژی ئەنجام دەدا، یەکەم

چالاکی سەربازیی کە خۆم فەرماندەییم کرد ئەرکی ئەوەبوو پارە بۆ شۆڕش و شۆڕشگێڕان دابین بکات، چونکە پارەمان نەبوو، بۆیە دەستمگرت بەسەر ئەو پارەی توتنەی لە هەولێرەوە بۆ کۆیە نێردرابوو، بۆسەیەکمان بۆ ئەو کاروانە دانا کە پارەکەی دەگواستەوە و دەستمان بەسەردا گرت، پارەکە 30 هەزار دینار بوو کە بۆ ئێمە سەرچاوەیەکی یارمەتی دارایی گەورە و سامانێکی زۆر گەورە بوو، بەم پارەیە چەکمان نەکڕی، چونکە وەك باسمکرد، دەستمان بەسەر چەکدا دەگرت و زەحمەتمان لەو کارەدا نەدەبینی، بەڵام بڕی (30) هەزار دینارەکەمان بەم شێوەیە دابەشکرد: دە هەزار دینارمان بۆ جەنەڕاڵ بارزانی نارد بۆ ئەوەی بەسەر ئەو پێشمەرگانەدا دابەشی بکات کە لە ژێر فەرماندەییدا بوون، 10 هەزار دیناریشمان نارد بۆ مەکتەبی سیاسی کە هێشتا لە شارەکاندا خۆی شاردبووەوە، بەتایبەتی لە سلێمانی، 10 هەزار دیناریشمان بەسەر پێشمەرگەکاندا دابەشکرد، ئەمەش یەکەمجار بوو هەندێك پارە بدەینە پێشمەرگەکان، هەروەك جلوبەرگی نوێیشمان بۆ کڕین».

تاڵەبانی کە وەك فەرماندەیەکی سەربازیی هەڵبژێردرا و لەو ئەرکەشیدا سەرکەوتوو بوو وەك چۆن لە خوێندن و کاری حزبیشدا سەرکەوتوو بوو، دیارترین ئەو شەڕانەی لەیادە کە پێشمەرگەکانی لەو کاتەدا کردوویانە و دەڵێت: «لە چەمی ڕەزان 14 پێشمەرگە بووین، وەك پێشتر باسمکرد، پاش ماوەیەك ژمارەی ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ مندا بوون، بوون بە هەزاران و شەڕمان زۆر کردووە، گرنگترین شەڕ کە لەو کاتەدا کردمان ڕزگارکردنی ناوچەی شارباژێر بوو لە شەوی

21 ئازاری 1962 کاتێك هێرشێکی فراوانمان کرد لە ناوچەی شارباژێڕ و دەستمان بەسەر هەموو مەخفەرەکاندا گرت، تەنیا مەخفەری شار نەبێت کە نەمانتوانی دەستی بەسەردا بگرین، بەڵام بەسەدان پارچە چەکمان دەستکەوت و دەیان پێشمەرگەش بە خۆبەخش هاتن لەگەڵمان، بەڵام شەڕی دووەم شەڕی ڕزگارکردنی پێنجوێن بوو کە دەستمانگرت بەسەر پێنجوێن و دەوروبەریدا، پاشان شەڕی چەمی ڕەزان کە تێیدا شەڕی ڕاستەوخۆ لەدژی هێزەکانی حکومەت چەند هەفتەیەك بەردەوام بوو».

ئەم شەڕ و سەرکەوتنانە کە پێشمەرگەی کورد بە فەرماندەیی تاڵەبانی بەدەستیانهێنا دووربوون لە ڕێنماییەکانی بارزانی سەرکردەی کورد، لە سایەی نەبوونی پەیوەندی ڕاستەخۆی تەواویشدا بوو لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی بزووتنەوەی کورد کە ئەو کاتە لە ناوچەی بادینان بوو کە ناوچەیەکی دوورە، مام جەلالیش فەرماندەی سەربازی هەردوو ناوچەی کەرکوك و سلێمانی و تەنانەت خانەقینیش بوو، تاڵەبانی دەڵێت: «ئەو هێزەی فەرماندەییم دەکرد ناوی ڕزگاری بوو» هەروەها دەڵێت: «هۆکاری پەیوەندیکردنمان چ لەگەڵ بارزانی یاخود هێزەکانی دیکەدا نەبوو، هەمیشە نێردراوێك یاخود تەتەرێکمان دەنارد بۆ گەیاندنی هەر شتێك یان ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵ و فەرمانەکان، لەگەڵ ئەوەشدا هاوئاهەنگی نێوانمان زۆر زۆر باش بوو، هەروەك دەستمان گرتبوو بەسەر ناوچەیەکی فراواندا کە تا قەرەداغ درێژ دەبووەوە، نەقیب کەمال موفتیش دەستیگرتبوو بەسەر هەڵەبجە و ناوچەکانی دەوروبەریدا».

بەڵام ئایا وانەکانی کۆلێجی ئیحتیات بەسن بۆ دروستکردنی فەرماندەیەکی سەربازیی دیاری وەك تاڵەبانی؟ ئەو دەڵێت: «شارەزایی شەڕم لە گۆڕەپان و ئەو شەڕانە بەدەستهێناوە کە کردوومن، ئەمە سەرەڕای ئەو شارەزایی و زانیاریانەی لە کۆلێجی ئەفسەرانی ئیحتیات بەدەستمهێنابوون، کتێبەکانی ماو تسی تۆنگیشم لەبارەی شەڕی پارتیزانی دەخوێندەوە».

هەموو شتێك لە سەردەمی زەعیم عەبدولکەریم قاسمدا ناجێگیر دیاربوو، تەنانەت کاتیش ناجێگیر بوو و لە ڕیزی کەسدا نەبوو، بۆیە ئەوەی بە «شۆڕشی تەمموز»ی 1958 ناسرابوو جگە لە کوشتوبڕ و برین و غەم و کارەسات هیچی دیکەی بەدوای خۆیدا نەهێنا، تاکو ئەمڕۆش عیراقییە بەتەمەنەکان باسی دەکەن و دەڵێن هەموو ئەو کارەساتانەی لە وڵاتدا ڕوودەدەن سزادانی عیراقییەکانە کە سڵیان لە سەربڕینی خێزانی پادشا و نوری سەعیدی سەرۆکی حکومەت و کوڕەکەی نەکردەوە.

لەگەڵ هاتنی قاسمی (تاکە سەرکردە) و (ڕۆڵەی خێرخواز)و بەرزبووەنەوەی دەنگی لایەنگرانی لە دادگای مەهداویدا (دادگای گەل) کە گوریسیان هەلگرتبوو و هاواریان دەکرد «لەسێدارەی بدە.. عەبدولکەریم لە سێدارەی بدە» هەتا دیمەنی عیراق بووە گۆڕەپانی شەڕ و یەکتر کوشتن لە موسڵ و باشوور و ناوەڕاستدا، تەنانەت خودی زەعیمیش، ئەو بەرپرسە سەربازییە نیگەرانەی کە ئەزموونی لە سیاسەتدا نەبوو شڵەژابوو و نەیدەزانی چۆن کەشتییەکە بەڕێوەبەرێت، بۆیە جارێك شیوعییەکانی نزیك دەکردەوە و جارێك ناسیۆنالیستەکانی دووردەخستەوە و جارێك پشتیوانی کوردی دەکرد و پێشوازیی لە مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی شۆڕشەکەیان دەکرد، جارێکیش فڕۆکەکانی دەنارد بۆ بۆردومانکردنی شار و گوندەکانیان و بێ تاوانانیان دەکوشت، مێژووی عیراقیش ئەوە تۆمار دەکات یەکەم حکومەتی کۆماری بوو کە کورد چاوەڕێی دەکرد سەردەمی جەنگی حکومەتەکانی عیراقی لە دژی کوردی عیراق دەستپێکرد و هەموو حکومەتەکانیش لەسەر ئەم ڕێچکە خوێناوییە ڕۆیشتن.

ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییانەی عەبدولکەریم قاسم لە دژی کورد ئەنجامیدان هیچ ئەنجامێکیان بەدەستنەهێنا، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێشمەرگە لە شەڕەکان و لەو شەڕە پارتیزانیانەدا سەردەکەوتن کە لەدژی بنکەکانی سوپای عێراق بەرپایان دەکردن، زۆرجاریش سەربازەکان دوای بەدیلگرتنیان لەلایەن پێشمەرگەی کوردەوە دەگەڕانەوە و لە شارەکانی دیکەی عێراق باسی بەدیل گیرانی خۆیان و ئەو مامەڵە مرۆییانەیان دەکرد کە کورد لەگەڵیان نواندوویانە و تەنانەت گەڕاندووشیاننەتەوە بۆ خێزانەکانیان، عێراقییەکان بەم شەڕەیان دەوت (جەنگی باکوور)، لە کاتێکدا عێراق بە ڕەسمی ناوی یاخیبووانی لە کورد نابوو. ناوی مەلا مستەفای بارزانیش وا دەرکەوت کە سەرکردەیەکی نەتەوەییە و نایەوێت شەڕ لەدژی ڕۆڵە عێراقییەکانی گەلەکەی بکات.

لە شوباتدا بەعسییەکان لەگەڵ عەبدولسەلام عارف ڕێککەوتن کە لەگەڵ قاسم بەشداری لە کودەتای 14ی تەممووزدا کرد و ناکۆکی لەگەڵ هەڤاڵەکەی خەباتی چەکداریی دروستبوو لەبەرئەوەی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خۆی پلانی داڕشتووە و ڕێبەرایەتی شۆڕشی کردەوە لە کاتێکدا قاسم تواناکانی ئەوی دزیوە، لە ئاکامی ناکۆکی دوورودرێژیشدا قاسم ئەوی زیندانیکرد و لەسەرکار لای برد و بەدەستبەسەری هێشتیەوە و لەسێدارەی نەدا، لەبەرئەوە عارف لەگەڵ بەعسییەکان ڕێککەوت بۆ ئەنجامدانی کودەتایەك کە لە شوباتی 1963دا قاسمی ڕووخاند و سەرکردە بەعسییەکانی کودەتا عەبدولکەریم قاسم-ی سەرۆك وەزیرانیان لە ستۆدیۆیەکی ڕادیۆی عێراق لە ساڵحیە کوشت.

ئەو ڕژێمە نوێیەی عارف سەرۆکایەتی کرد و ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆکایەتی حکومەتەکەی دەکرد، پێویستی بە پشوویەك و

سەقامگیری هەبوو بۆ چڕکردنەوەی حوکمەکەی، ئۆپەراسیۆنەکانی باکوور یاخود شەڕی کوردیش زۆر لەسەری دەکەوت ئەگەر بڕیاری درێژەپێدانی بدایە، لەبەرئەوە پەنای بۆ ئاگربەستی دانوستاندن برد کە تاڵەبانی بەوپێیەی سەرۆکی وەفدی کورد بوو لە دانوستاندن لەگەڵ حکومەت باسی دەکات و دەڵێت: «پاش پلانگێڕییەکەی شوباتی 1963 کە تێیدا عەبدولسەلام عارف و بەعسییەکان دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت و قاسمیان لەناوبرد، دانوستاندن لە نێوان ئێمە و حکومەتەکەی عارفدا بەڕێوەچوو، لەلایەن بارزانی و مەکتەبی سیاسییەوە کە هەردووکیان متمانەیان پێدەکردم، نێردرام بۆ بەغدا بۆ ئەنجامدانی دانوستاندن لەگەڵ ڕژێمی تازە، من و ساڵح یوسفی چووین بۆ بەغدا، حکومەت شوێنی نیشتەجێبوونی لە ئوتێل بەغدا بۆ تەرخانکردین کە ئەو کاتە لە بەناوبانگترین ئوتێلەکانی عیراق بوو، لە شەودا فەریق تاهیر یەحیا سەرۆکی ئەرکانی سوپا سەردانی کردین، لەبارەی داواکارییەکانمانەوە پرسیاری لێکردم منیش وتم: ئێمە لەسەر هەمان ڕێککەوتنی پێشووین، چونکە بەر لە ڕووخاندنی قاسم لەڕێی نامەوە ڕێککەوتنێك لە نێوان سەرکردەکانی ڕژێمی تازە و ئیبراهیم ئەحمەددا هەبوو بریتی بوو لەوەی دان بە ئۆتۆنۆمی بۆ کورددا بنێن دوای ڕووخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆریی، ئەویش وتی: ئەمە باشە. بۆ ڕۆژی دواتر چاوم کەوت بە عەبدولسەلام عارف سەرۆك کۆمار و ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆك وەزیران و ساڵح مەهدی عەمماش وەزیری بەرگری و عەلی ساڵح سەعدی جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ و حازم جواد کە ئەوکاتە وەزیری دەرەوە بوو بە وەکالەت. وەفدی کوردیش بە سەرۆکایەتی من و ئەندامێتی ساڵح یوسفی و شێخ بابە شێخ عەلی مەحمود

(وەزیر بوو) و فوئاد عارف (وەزیر بوو) و محەمەد سەعید خەتاب و چەند کەسێکی تر بوو، لە یەکەم دیداردا باسی ئۆتۆنۆمیمان کرد و بەعسییەکان وتیان: ئێمە لەڕووی بنەماوە ڕازین بە ئۆتۆنۆمی، بەڵام کاتێك مۆڵەتمان دەوێت. عەمماش بوو کە داوای مۆڵەتەکەی کرد، بەڵام بەکر وتی: ئێمە لە سەرۆك جەمال عەبدولناسر دەترسین (سەرۆکی پێشووتری میسر) ئەگەر ئۆتۆنۆمیتان بدەینێ ڕەنگە بڵێت ئێمە عیراق پارچە پارچە دەکەین و نیشتمانی عەرەب دابەشدەکەین. وەفدی عیراقیش ئامادەبوو بۆ ئەوەی سەفەر بۆ قاهیرە بکات بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی یەکگرتنی نێوان میسر و سوریا لە 22ی شوباتدا، بۆیە پێشنیازیان بۆکردین لەگەڵیان سەفەر بکەین تا عەبدولناسر بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، لەوانەشە بە داواکارییەکانمان سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی ڕازی نەبێت، بۆیە من و فوئاد عارف لەگەڵیان چووین».

لێرەدا تاڵەبانی باسی زانیارییەکی گرنگ لەبارەی بەعسییەکانەوە دەکات و دەڵێت: «با شتێکی گرنگت پێ بڵێم، ڕەنگە ئەم ڕایەی کە پێت دەڵێم سەیر بێت لەوەی سەبارەت بە بەعسییەکان دەیبیستیت، ئەویش ئەوەیە کە حزبی بەعس ئەو کاتە بڕیاری نەدابوو شەڕ لەگەڵ گەلی کورد بکات، لەلای ئەوانەوە بڕیاردرابوو هەندێك مافمان بدەنێ و ئەگەر پێیان ڕازی نەبین ئەوا شەڕمان لەگەڵ بکەن، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبێك لەبارەی (کێشەی کورد لە عیراق) لە نووسینی دکتۆر جەمال ئەتاسی لە پێشەکییەکەیدا دەڵێت (کاتێك عەلی ساڵح سەعدی هات بۆ دیمەشق لەبارەی کورد لە عیراق پرسیارمان لێکرد وتی بەڵێ هەندێك دیدار لە نێوانماندا بووە و ئێمەش هەندێك بەڵێنمان پێداون و ئێستاش هەندێك بەڵێنیان بۆ

جێبەجێ دەکەین و ئەگەر ڕازی نەبن ئەوا بە خێرایی لەناویان دەبەین) تەنانەت من لە بەغدا ڕای جیاوازم لەبارەی کێشەی کوردەوە بیست، چونکە لە گەشتە ئاسمانییەکەماندا لە بەغداوە بۆ قاهیرە لە دواوە دانیشتبووم و سەعدی هات لە تەنیشتمەوە دانیشت و لەبارەی ڕەوشی کوردەوە پرسیاری لێکردم، پاشان پێیوتم: ئێمە حزبی بەعسین، حزبێکی سۆسیالیستە باوەڕمان بە ماڤ گەلان و نەتەوەکان هەیە، بگرە باوەڕمان بە ماڤ چارەی خۆنووسینی گەلی کوردیش هەیە، بەڵام دەمانەوێت ئەم مافە بدەینە هێزی پێشکەوتنخوازی کوردستانی و ئەوەش لە هەلومەرجی گونجاودا بێت. ئینجا بەردەوامبوو و وتی: ئێوە ئێستا هەڵەیەکی گەورە دەکەن کە دالّدەی شیوعییەکان دەدەن و دەیانپارێزن هەروەها ئەوانەشی کە لە یاسا هەڵاتوون، ئەمەش هەڵوێستێکی دژ بە شۆڕشە. منیش پێموت: ئێمە ئیلتیزامی ئەخلاقیمان بەرامبەر شیوعییەکان هەیە، وەك چۆن لە کاتی ئۆپۆزسیۆندا لەگەڵ ئێوە بووین، ئەویش وتی: با دواتر باسی ئەم بابەتە بکەین. سەعدی تێڕوانینی ئەوەی دامێ کە ئەوان تەنانەت لەدژی کوشتنی شیوعییەکانیشن، چونکە پێیوتم: ژمارەیەك سەرکردەی شیوعیمان لەلایە کە زیندانین وەك سەلام عادل و کەسانی دیکە، منیش ئەوەم نەدەزانی، هەروەها سەعدی وتی: ئێمە ئێستا دانوستاندنیان لەگەڵ دەکەین بۆ گەیشتن بە ئەنجام. ئەگەر کتێبەکەی هانی هیندی (نووسەری کتێبی بزووتنەی نەتەوەیی عەرەب-ە) بخوێنینەوە ئەوا دەزانین چۆن عەسکەر سەریان لە سیاسییەکان شێواند و سەرکردەکانی حزبی شیوعی عیراقیان کوشت بەبێ ئەوەی ڕێگە بدەن دانوستاندنەکان تەواو بکرێن».

سەرۆك تاڵەبانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: «هەرچی حازم جوادیشە، خوا تەمەندرێژی بكات، ئەوا سەرۆكی وەفدی دانوستانكاری عیراق بوو، لە وەزارەتی دەرەوە یەكترمان بینی و پێیوتین: ئێمە وەك سۆسیالیستی پێشكەوتنخواز دان بە مافی چارەی خۆنووسینی گەلی كورددا دەنێین بە مافی سەربەخۆبوونیشەوە، پێشمانوایە كە چارەسەری كۆتایی كێشەی كورد لە بوونی كوردستانێكی سۆسیالیستی سەربەخۆدایە، ئەمە رای ئێمەیە، بەڵام دەبێت ئەو هەلومەرجە تاووتوێ بكەین كە ئایا یارمەتیدەرمانە و تا چ ئاستێك یارمەتیمان دەدات، دەمانەوێت لەبارەی ئەمەوە وتووێژتان لەگەڵ بكەین، منیش وەڵامم دایەوە: ئێمە رازین نیوەی ئەوەمان بدەنێ كە باستان كرد كە ئەویش ئۆتۆنۆمییە نەك سەربەخۆیی. هەڵوێستی ئیجابی بوو و تێڕوانینێكی باش لە مێشكمدا سەبارەت بەم پیاوە چەسپا بەوپێیەی مرۆڤێكی پێشكەوتنخوازبوو نەك شۆڤێنی و، مەنتیقییش بوو، تەنانەت هاوڕێیەتییەكمان دروست كرد بەردەوامبوو تا دوای ئەوەش كە بەعس بۆ دووەم جار دەسەڵاتی گرتەوەدەست (دوای 1968)، چونكە زۆرجار پێی دەوتم كە بایەخ بە گفتوگۆ لەگەڵ سەدام حسێن بدەین، چونكە گرنگترین كەسە لە دەوڵەت و حزبدا و ئەوەی سەدام بڕیاری لێدەدا ئەوە جێبەجێ دەكرێت هەروەك پەیوەندییمان بەردەوام بوو لەدوای چوونەدەرەوەشی لە عیراق و كاتێك لە ئۆپۆزسیۆن بووین لە لەندەن یەكترمان دەبینی و هاوسۆز بوو لەگەڵمان».

سەرۆك تاڵەبانی هەروەها بەردەوام دەبێت و دەڵێت: «نهێنییەكت لەبارەی حازم جوادەوە بۆ ئاشكرا دەكەم، جارێكیان لە دوای قۆناغی دووەمی شۆڕشی كورد كە بارودۆخمان خراپبوو، لە

ماڵی عومەر مستەفا لە بەغدا بینیم و بردمیە چێشتخانەکە و تەنیا خۆمان بووین، دە هەزار دۆلاری دامێ و وتی: بەخوا ئەمە لە پارەی حەڵاڵی خۆمە و پێویستم پێی نییە وەك ئەوەی ئێوە لە شۆڕشی کورددا پێویستیتان پێیەتی، بۆیە تکایە لێم وەربگرە وەك پشتیوانییەکی من بۆ شۆڕشەکەتان. من دەمێکە بەدوایدا دەگەڕێم و هیوادارم ئەوەش لە ڕۆژنامەکەتاندا بڵاوبکەنەوە، بەڵکو سەرکەوتوو بین لە بینینی و سڵاوی لێبکەین».

هەڵەی گەورەی حکومەتی نوێ ئەوەبوو کە تاڵەبانی بانگهێشتکرد تا یاوەری بکات بۆ بینینی جەمال عەبدولناسر سەرۆکی میسر، چونکە ئامانجی ئەم پێشنیارە دروستکردنی دوژمنایەتی بوو لە نێوان عەبدولناسر و تاڵەبانیدا، بەعسییەکان ئەو کاتە پێیانوابوو کە سەرۆکی میسر سەرکردەی نەتەوەی عەرەبە و ڕێگەنادات بە کوردەکان ئۆتۆنۆمییان هەبێت و ئەوە بە پارچە پارچەبوونی خاکی عەرەب و شتی لەو جۆرە دادەنێت، بەڵام بابەکە بەپێچەوانەی ئەوەوە هەڵیکرد کە کەشتییەکانی حکومەتی عارف – بەعسی دەیانویست، تاڵەبانی لەو بارەیەوە دەڵێت: «لە قاهیرە عەبدولناسر وەك وەفدی عیراق پێشوازی لێکردین، بەڵام من و فوئاد عارف داوامان کرد بەشێوەیەکی تایبەت بیبینین ئەویش ڕازیبوو و پێشوازی لێکردین، ئەگەر سەیری وێنەکەیشم لەگەڵ عەبدولناسر بکەیت ئەوا دەبینیت جلوبەرگی کوردیم لەبەردایە، ئەمەش لەبەرئەوە نەبوو کە من پابەندم بە جلوبەرگی کوردی و لە ڕوانگەیەکی نەتەوەییەوە بێت، نەخێر، بەڵکو کاتێك شەوی 18ی شوبات گەیشتمە بەغدا لە سلێمانییەوە بە جلوبەرگەکانی خۆمەوە هاتبووم و لە بەغدا قاتی ئاساییم نەبوو (جلوبەرگی ئەفەندی) لە بەغداش کاتم نەبوو بۆ ئەوەی قاتێکی

ئاسایی بدرووم لەبەرئەوە بەجلوبەرگە کوردییەکانمەوە سەفەرمکرد».

کاتێك عەبدولڕەحمان بەزاز بە عەبدولناسری ناساندم پێیوت: جەنابی سەرۆك هیوادارم بەم جلوبەرگانە هەڵنەخڵەتێیت، لەبەرئەوەی جەلال تاڵەبانی پارێزەرە و یەکێك بووە لە قوتابییەکانم لە کۆلێجی حقوق، منیش دەستمکرد بە قسەکردن و وتم: بەڵێ قوتابی ئەو بووم و ئەو لە کۆلێج دەریکردووم کە ڕاگری بوو.

هەروەها بەپێچەوانەی ئەوەی وەفدی حکومەتی عیراق پێشبینیان دەکرد کە گوێیان لە پیرۆزبایی عەبدولناسر بێت سەبارەت بە کوژرانی قاسم لەبەر ئەو ناکۆکییە عەقائیدییانەی لەنێوان هەردووکیاندا هەبوو، بەڵام ئەوەی بیستیان تەواو بەپێچەوانەی ئەمەوەبوو.

بەپێی قسەکانی تاڵەبانی عەبدولڕەزاق شەبیب باسی شیوعییەکانی کردووە و عەبدولناسریش وتوویەتی: «برایان با پێتانبڵێم کە من پێمناخۆشبوو بۆ هەرکەسێك لە عیراق کوژرا لەپێش هەموویانیشەوە بۆ عەبدولکەریم قاسم، چونکە ئەم پیاوە ڕێبەرایەتی شۆڕشێکی کرد و دەبووایە بینێرن بۆ ئێرە لە قاهیرە لەبری ئەوەی بکوژرێت، بەڵام پێمناخۆش نەبوو بۆ کوشتنی مەهداوی (فازڵ مەهداوی سەرۆکی دادگای گەل لە سەردەمی قاسمدا)، دڵمخۆش نەبوو، بەڵام پێشمناخۆش نەبوو، چونکە جنێوی بە شەرەفمان دەدا و هەموو ڕۆژێك جنێوی پێدەداین. ئینجا داوام لێکرد کە من و فوئاد عارف ببینین کە وەزیر بوو لە حکومەتە تازەکەدا، ئەویش وتی: بەخێربێن. لەگەڵ وەفدە حکومییەکەی عیراق دەچووین بۆ جەزائیر، بۆیە پێشوازی لێکردین و لەبارەی کێشەی کورد و کوردەوە گفتوگۆمان کرد و سڵاوی مەلا مستەفای بارزانی و مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانمان پێگەیاند و پێمانووت کە ئێمە نامانەوێت لە عیراق جیاببینەوە و دژی نەتەوەی عەرەب نین، بەڵکو پشتیوانی بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەب دەکەین بە سەرۆکایەتی ئێوە، ئەوەشمان بەبیرهێنایەوە کە ئێمە لە دژی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو (کە ناوی کۆماری میسرە لەوکاتەدا) نەوەستاوینەتەوە لە سەردەمی قاسمدا، هەرچەندە حزبێکی ئاشکرابووین، هەموو ئاواتیشمان ئەوەبوو کە ڕۆڵی خۆی بگێڕێت بۆئەوەی لە چوارچێوەی عیراقدا ئۆتۆنۆمی وەربگرین و نە دەمانەوێت جیاببینەوە و نە دژایەتی نەتەوەی عەرەبیش بکەین.

تاڵەبانی لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت، کە عەبدولناسر وتی: «ئێمە لە نەتەوەی عەرەب هەڵوێستێکی مەبدەئی جێگیرمان بەرامبەر بە مەسەلەی نەتەوایەتی نییە، بە پێچەوانەی شیوعییەکانەوە کە هەڵوێستی خۆیان لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە هەیە، ئینجا کتێبێکی لە کتێبخانەکەی دەرهێنا کە لەبارەی مەسەلەی نەتەوەکان بەپێی بیری مارکسیی لینینەوە بوو، ئینجا بەردەوامبوو و وتی: «مارکسیەت هەڵوێستێکی هەیە لە بەرامبەر ئەم مەسەلەیەدا، ئینجا وتی: من گوێم لە ئێوە گرت و بیر لەوەدەکەمەوە کە باستانکرد و کاتێك دەگەڕێنەوە لە جەزائیر دیدارمان دەبێت، جەختیشی لە دەستپێنەکردنەوەی شەڕ و بایەخی خەباتی هاوبەشی عەرەب و کورد کردەوە».

تاڵەبانی و وەفدی حکومەتی عیراق لە جەزائیر بینیان هەڵوێستی ئەحمەد بن بیلا-ی سەرۆکی ئەوسای جەزائیر ڕوونتر و لایەنگرانەتربوو، تاڵەبانی ئەوەش ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: «سەفەرمان کرد بۆ جەزائیر و چاومان بە ئەحمەد بن بیلا سەرۆکی جەزائیر کەوت کە هەڵوێستی ڕوونتربوو بەرامبەر کێشەی کورد و بە ڕاشکاوی بە وەفدە حکومییەکەی عیراقی وت: برایان بە ئۆتۆنۆمی ڕازیبن و پەلەبکەن لە جێبەجێکردنی، چونکە ڕۆژێك دێت کورد داوای زیاتر لە ئۆتۆنۆمیتان لێدەکەن، منیش بەپشتبەستن بە ئەزموونەکەمان لە جەزائیر بەم ڕوونییە قسەتان بۆدەکەم، چونکە فەرەنساییەکان ئەوەیان ڕەتکردەوە ئۆتۆنۆمیمان بدەنێ کاتێك کە داوامانەکرد بۆیە سووربووین لەسەر سەربەخۆیی تەواو، پاشان گەلی کوردیش گەلێکی موسڵمان و دۆستیشە».

وەفدی حکومەتی عیراق لەگەڵ تاڵەبانی و عارف لە جەزائیرەوە دەگەڕێتەوە بۆ قاهیرە و ئەو کەسەش کە لە هەمووان زیاتر بە پەرۆشبوو بۆ ئەم گەڕانەوەیە بۆ بینینی عەبدولناسر، تاڵەبانی

بوو تا ڕای سەرۆکی میسر سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی بزانێت وەك خۆی بەڵێنی پێدابوون. تاڵەبانی دەڵێت: «کاتێك لە جەزائیر گەڕاینەوە چاومان کەوت بە عەبدولناسر و وتی مەسەلەکەی لێکداوەتەوە و پێیوتم کە ڕازییە بە ئۆتۆنۆمی بەگوێرەی ئەو ڕوونکردنەوەیەی کە من پێشکەشمکرد، دواتریش لە لێدوانی ڕۆژنامەنووسیدا وتی: من ڕازیبووم بە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد بەپێی ئەو ڕوونکردنەوەیەی جەلال تاڵەبانی پێشکەشیکردم. داواشی لێکردین کە شەڕ دەستپێنەکەین و دەرفەتێك بدەینە حکومەتی نوێ لە عیراق، ئاگاداریشیکردینەوە کە شای ئێران کێشەی کورد دەقۆزێتەوە بۆیە ئەو دەرفەتەی مەدەنێ، منیش پێموت بەکر دەڵێت: ئێمە دەمانەوێت ئۆتۆنۆمی ئیمزا بکەین، بەڵام لە عەبدولناسر دەترسین، ئەویش وتی: پێیبڵێن با ڕێککەوتنەکەتان لەگەڵ ئیمزا بکات و بێن بۆ ئێرە لە قاهیرە تا خۆم ڕاییبگەیەنم».

سەرۆك تاڵەبانی بەردەوام دەبێت: «گەڕاینەوە بۆ بەغدا ئەوەی عەبدولناسر وتبووی وەك خۆی پێمڕاگەیاندن، بۆیە هیچ بانوویەکیان نەما، بەڵام عەمماش سووربوو لەسەر دواخستنی ئیمزاکردنەکە، بۆیە کاتێك لە نووسینگەکەی لە وەزارەتی بەرگری بینیمان کە لەپشت مێزەکەیەوە دانیشتبوو وەك وەزیری بەرگری، پێیوتم: فەرموو لێرە لە شوێنی من دابنیشە و دەقی بەڵگەنامەی ئۆتۆنۆمی بنووسە و منیش دەچم بۆئەوەی ئیمزاکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشتان بۆ بهێنم، بەڵام دەمانەوێت ماوەی شەش مانگ لێمان بووەستن. منیش وەڵاممدایەوە کە دەسەڵاتی دواخستنم نییە و وتم: ئێوە دانبەوەدا دەنێن کە ڕێککەوتنێکی پێشوو لەنێوانماندا هەیە و ئێوە پێیڕازین و ئێمەش هاتووین بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتنە، بەڵام بۆ مەسەلەی دواخستن ئەوا

دەبێت بچم بارزانی ئاگاداربکەم و مەسەلەکە تاووتوێ بکەین. لەبەرئەوە بەدەست بەتاڵی گەڕاینەوە بۆ ناوچەی ڕانیە کە مەلا مستەفای بارزانی لەوێ بوو، هیچ شتێکیش نەهاتەدی، چونکە ڕازی نەبوو بە دواخستن».

تاڵەبانی ئیعتیراف دەکات و دەڵێت: «با شتێکت پێبڵێم ئەویش ئەوەیە کە ئێمە ئەندامانی وەفدی دانوستانکار، من و شێخ بابە عەلی شێخ مەحمود و محەمەد سەعید خەفاف و سالح یوسفی و فوئاد عارف لەگەڵ ئەو پێشنیارەدابووین کە ئەویش دواخستنی ئیمزاکردنەکە بوو بەمەرجێك بەڵگەنامەیەکمان بدەنێ کە دان بە مافی ئێمە لە ئۆتۆنۆمیدا بنێت و لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشەوە ئیمزا کرابێت و جێبەجێکردنەکەی تا شەش مانگی داهاتوو دوابخرێت، ئەمەش بە سەرکەوتنێکی گەورە و دانپێدانانێکی گرنگ دادەنرێت بە مافەکانی گەلی کورد و بەوەی کە ئۆتۆنۆمی تاوان یاخود جیابوونەوە لە عیراق نییە و تەنانەت پیلانیش نییە لە دژی نەتەوەی عەرەب. پێشمانوابوو کە ماوەی شەش مانگ زۆرکەمە لەکاتێکدا ئەوان لە ڕێککەوتنی ئاداردا دووساڵیان دابوو بۆ ئیمزاکردنی یاداشتی ئۆتۆنۆمییەکە، بەڵام کێشەکە ئەوەبوو ئەوان جددی نەبوون لەم پێشنیارەدا، جگە لەوەش بارزانی پێشنیارەکەی ڕەتکردەوە».

سەرەڕای پێچوپەنای حکومەتی عیراق لەگەڵ کورد لەوکاتەدا ئەوا ئەو بەڵێنەیان پاراست کە دابوویان بە سەرۆك عەبدولناسر بەوەی کە دەسپێشخەری شەڕ نەبن، تاڵەبانی ئەوەش ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: «بەپێی ئەو بەڵێنەی بە سەرۆك عەبدولناسرمان دابوو ئێمە ڕوومان نەکردە شەڕ و بڕیارماندا لە هەڵوێستی بەرگریدا بمێنینەوە و دەشمانزانی کە حکومەت دەست بەشەڕ دەکاتەوە لەگەڵماندا».

دوای شکستهێنانی خولی یەکەمی دانوستاندن لەنێوان حکومەتی عیراق و کورد لەبەر سووربوونی سالّح مەهدی عەمماش وەزیری بەرگری بۆ دواخستنی ئیمزاکردنی ڕێکەوتنەکە تا ئۆتۆنۆمی بدرێت بە کورد، سەرکردایەتیی کورد ئومێدبڕاو نەبوو لە ئەگەری درێژەپێدان و هەوڵی چەسپاندنی کۆڵەگەکانی ئاشتی لە هەموو عیراقدا، لە ڕوانگەی سووربوونیش بۆ ئاشتی و بۆ ئەوەی گەلی عیراق بە هەموو نەتەوە و گروپەکانیەوە بە ئارامی و بە ئاشتی بژی، کۆنگرەیەکی میللی و عەشایری و سیاسی لە کۆیە بەسترا و مەلا مستەفای بارزانی ئامادەیبوو کە سەرۆکایەتیکردنی کۆنگرەکەی بە مام جەلال سپارد، پێشنیاریشکرا وەفدێك لە کەسایەتیی عەشایر و حزبی پێکبهێنرێت کە سالّح یوسفی و حەبیب محەمەد کەریم و عەقید ڕوکن مستەفا عەزیز و چەند کەسایەتییەکی ناسراوی وەك حسێن خانەقا و مەسعود محەمەد و ڕەشید عارف و محەمەد سەعید خەفاف و هەردوو وەزیری کورد بابە عەلی و فوئاد عارف لەخۆدەگرت و بارزانی سەرۆکایەتی ئەم وەفدەشی بە مام جەلال سپارد، لەم ڕووەشەوە تالّەبانی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ سەرۆك بارزانی وەسف دەکات و دەڵێت: «پەیوەندیم لەگەڵ سەرۆك بارزانی زۆرباشبوو نزیکبووم لێی تا لە ساڵی 1964دا ناکۆکی دروستبوو، یەکێك بووم لە هەرە لایەنگرانی و خۆشەویستی زۆری هەبوو بۆم، هەر ئەویش بوو بە پێشنیاری خۆی دەستنیشانیکردم بۆئەوەی دووجار سەرۆکایەتی وەفدی دانوستانکاری کورد لەگەڵ حکومەتی عیراق بکەم، جارێکیان لەلایەن حزبەوە بوو، جاری دووەمیش لە کۆنگرەکەی کۆیەدا وەك باسمکرد، زۆرجاریش گاڵتەم لەگەڵ دەکرد و قبوڵی دەکرد».

هەروەها تالّەبانی دەڵێت: «بۆ جاری دووەم چووین بۆ بەغدا بۆ دانوستاندن و حکومەت پرۆژەی پارێزگاکانی پێشکەشکردین کە پرۆژەیەکی بریقەداربوو هیچ بایەخێکی نەبوو دەسەلاتی زیاتری

دەدایە پارێزگاکان نەك پرۆژەی ئۆتۆنۆمی، ئێمەش ئەو پرۆژەیەمان ڕەتکردەوە. بەداخەوە حکومەتەکانی عیراق هەمیشە خەیاڵی ئەوەیان دەکردەوە کە ئێمە لە عیراق جیادەبینەوە ئەگەرچی ئێمە ڕۆژێك لەڕۆژان دروشمی جیابوونەوەمان بەرزنەکردبووەوە، چونکە عیراق نیشتمان و وڵاتمانە و ئەمەش گەلی ئێمەیە، هەموو خواستی ئێمە ئەوەبوو کە لە عیراقدا سیستمێکی دیموکراتی فرەلایەنی هەبێت کە بتوانین تێیدا لەگەڵ عیراقییەکانی دیکەدا بژین و بە مافەکانمان شادبین، بیریشمان لە سەربەخۆبوونی کوردستان لە عیراق و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ نەکردبووەوە، چونکە ئەوە نەدەهاتەدی. من هەمیشە باسی گەنجە توندڕەوەکانی کورد دەکەم کە ئەمڕۆ داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەکەن، بۆیە دەڵێم بیهێننە پێش چاوی خۆتان کە ئەمڕۆ سەربەخۆییمان ڕاگەیاندووە و حکومەت و پەرلەمانمان هەیە، ئەوەش بێننەوە خەیاڵی خۆتان کە دەوڵەتانی دراوسێمان دژایەتیمان نەکەن، ئەمەش مەحاڵە، چونکە ئەو دەوڵەتانە دژایەتیمان دەکەن ئەگەر سەربەخۆیی ڕابگەیەنین، خۆ بەلانی کەمەوە پەیوەندییمان لەگەڵ دەپچڕن و ئابلۆقەمان دەدەن، کەواتە چۆن دەژین، چی هاوردە دەکەین و چی هەناردە دەکەین؟ تەنانەت ئاویشمان لێدەبڕن و کەس ناتوانێت بگاتە ناوچەکانمان، کەواتە بیرۆکەی سەربەخۆبوون خەیاڵە، خەیاڵێکی جوان، بەڵێ، بەلام حزبێکی سیاسی بەرپرس لە جەماوەر و گەلەکەی، دەبێت هەر بەگیانێکی بەرپرسیارانەوە هەڵسوکەوت بکات، لەبەرئەوە من تەنانەت لە ڕابردووشدا پێمواندبوو حکومەتێکی سەربەخۆمان هەبێت، بەڵکو تێدەکۆشام بۆ عیراقێکی ڕزگاریخواز و دیموکرات و پێشکەوتنخواز و بە ئۆتۆنۆمی یاخود بە یەکێتییەکی فیدراڵی تێیدا بژین، لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیشدا ئەمەش خواستمان بوو».

ژیانی مام جەلال لەنێوان ئەوەی کە شەخسییە و ئەوەی حزبییە تێکەڵاو بووە، بگرە حزب بووەتە هەموو شتێك، بەتایبەتی کە تاڵەبانی لە تاقی لاویدا بەرەو لوتکە دەڕوات و گوێ نادات بەو ئاستەنگانەی دێنە ڕێی.

لەمیانی ئەوانەشدا هەڤاڵەکانی لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ئەوەی بەبیردەهێننەوە کە سەڵتە و دەبێت ژن بهێنێت، تەنانەت ئەوانیش هاوسەری ژیانی بۆ هەڵدەبژێرن کە ئەویش پێی ڕازی دەبێت، چونکە دەزانێت کێیە و کچی کێیە و بەم هەڵبژاردنە دڵخۆش دەبێت.

لە شاخ خۆی و هاوسەرەکەی کوخێکی لە قوڕدروستکراویان هەبوو لە دەوروبەری گوندێك کە دەکەوێتە سنووری پارێزگای سلێمانی، هەتا لە شاخیش بێت دڵی زۆر خۆشە کە لە پێناوی کێشەیەکدا خەبات دەکات کە باوەڕی پێیەتی، ئەمەش دروشمێك نییە کە لەسەردەمی خۆشگوزەرانیدا بەرزی کردبێتەوە، بەڵکو واقیعێکە لە سەردەمی شۆڕشدا تێیدا ژیاوە، لە کاتێکدا هێرۆخانی هاوسەری ژیانیان لە شاخ بەوە وەسف دەکات کە بریتییە لە «ژیانێك لە ناو جانتایەکی گەڕۆکدا».

تەنانەت کاتێکیش دەبێتە باوکی دوو کوڕ، ئەوا ژیانی خۆی و خێزانەکەی هەروا دەمێنێتەوە کە هاوسەرەکەی وتی «ژیانێك لەناو جانتای سەفەردا»، چونکە دوو کوڕەکە لە ئامێزی باپیر و نەنکیان، دایك و باوکی هاوسەرەکەی، ئیبراهیم ئەحمەد، مامۆستا و هەڤاڵی خۆشەویستی و هاوسەرەکەی، دوور لەوان لە لەندەن گەورە دەبن. هێرۆخانیش وەك پەیامنێرێکی جەنگ لەگەڵ ساتە سەخت و هەستیارەکاندا دەڕوات، شاخیش پڕیەتی لەو ساتانە، بۆ ئەوەی بە زومی کامێراکەی بیانگرێت و ببنە

دۆکۆمێنت و مێژوویەك، باوکیش یاخود مام جەلال تاڵەبانیش جێ پەنجەی خۆی لەسەر بەردی ئەم شاخ و ئەو شاخ دادەنێت، لە چیای «ماوەت»ەوە بۆ چیای «ئەزمڕ» و لەوێشەوە بۆ ناخی چیای «پیرەمەگروون» و پاشان چیای «سارا» لە دوکان، لەپێش هێزی پێشمەرگەوە دەڕۆیشت تا مێژوویەکی نوێ بۆ کورد و کوردستان و عیراق بێنێتە کایەوە.

دوای شکستهێنانی خولی یەکەمی دانوستاندن لە نێوان حکومەتی عیراق و کورد بەهۆی سووربوونی ساڵح مەهدی عەمماش وەزیری بەرگری بۆ دواخستنی ئیمزاکردنی ڕێکەوتنەکە تا ئۆتۆنۆمی بەکورد بدرێت، سەرکردایەتیی کورد ئومێدبڕاو نەبوو لە ئەگەری درێژەپێدان و هەوڵی چەسپاندنی کۆڵەگەکانی ئاشتی لە هەموو عیراقدا، لە ڕوانگەی سووربوونیش بۆ ئاشتی و بۆ ئەوەی گەلی عیراق بە هەموو نەتەوە و گروپەکانییەوە بە ئارامی و بە ئاشتی بژی، کۆنگرەیەکی میللی و عەشایری و سیاسی لە کۆیە بەسترا و مەلا مستەفای بارزانی ئامادەیبوو کە سەرۆکایەتیکردنی کۆنگرەکەی بە مام جەلال سپارد، پێشنیاریش کرا وەفدێك لە کەسایەتی عەشایر و حزبی پێکبهێنرێت کە ساڵح یوسفی و حەبیب محەمەد کەریم و عەقید ڕوکن مستەفا عەزیز و چەند کەسایەتییەکی ناسراوی وەك حسێن خانەقا و مەسعود محەمەد و ڕەشید عارف و محەمەد سەعید خەفاف و هەردوو وەزیری کورد بابە عەلی و فوئاد عارف لەخۆدەگرت و بارزانی سەرۆکایەتی ئەم وەفدەشی بە مام جەلال سپارد، لەم ڕووەشەوە تاڵەبانی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ سەرۆك بارزانی وەسف دەکات و دەڵێت: «پەیوەندیم لەگەڵ سەرۆك بارزانی زۆر باش بوو و نزیکبووم لێی تا لە ساڵی

1964دا ناكۆكی دروستبوو، یەكێك بووم لە هەرە لایەنگرانی و خۆشەویستی زۆری هەبوو بۆم، هەر ئەویش بوو بە پێشنیاری خۆی دەستنیشانی كردم بۆ ئەوەی دووجار سەرۆكایەتی وەفدی دانوستانكاری كورد لەگەڵ حكومەتی عیراق بكەم، جارێكیان لەلایەن حزبەوە بوو، جاری دووەمیش لە كۆنگرەكەی كۆیەدا وەك باسمكرد، زۆرجاریش گاڵتەم لەگەڵ دەكرد و قبوڵی دەكرد».

هەروەها تاڵەبانی دەڵێت: «بۆ جاری دووەم چووین بۆ بەغدا بۆ دانوستاندن و حكومەت پرۆژەی پارێزگاكانی پێشكەش كردین كە پرۆژەیەكی بریقەداربوو و هیچ بایەخێكی نەبوو و دەسەڵاتی زیاتری دەدایە پارێزگاكان نەك پرۆژەی ئۆتۆنۆمی، ئێمەش ئەو پرۆژەیەمان ڕەتكردەوە. لەو كاتەدا حكومەت سەرقاڵبوو بە وتووێژكردن لەگەڵ میسر بۆ پێكهێنانی یەكێتیی سێ قۆڵی میسر و سوریا و عیراق، بۆ ئەوەی كوردیش مافەكانیان لە نێوان ئەو سێ دەوڵەتە بەهێز و گەورەیەدا كە بەنیازبوون لەنێو خۆیاندا یەكبگرن، نەفەوتێت، یاداشتنامەیەكیان پێشكەش بە كۆنگرەكەی قاهیرە كرد».

هەروەها تاڵەبانی دەڵێت: «ئەم یاداشتنامەیەمان پێشكەش كرد كە ئیمزای منی بەسەرەوە بوو، تێیدا وتمان ئەو یەكێتییە پێشنیاركراوەی لە نێوان ئەو سێ دەوڵەتەدا ئەگەر یەكێتییەكی تێكەڵبوون بێت ئەوا ئێمە دەمانەوێت كوردستان وڵاتێكی سەربەخۆ بێت لەچوارچێوەی ئەم یەكێتییەدا، بەڵام ئەگەر ڕێككەوتن بكرێت لەسەر پرۆژەی یەكێتییەكی فیدراڵی ئەوا ئێمە داوای ئۆتۆنۆمیەكی فراوان دەكەین لە چوارچێوەی ئەو یەكێتییە عەرەبییە پێشنیاركراوەدا. ئەم پێشنیارە وەڵامدانەوەی درۆیەك بوو كە بەعس بڵاویكردبووەوە و ئەوەی

دەگەیاند کە کورد بەرهەڵستی بەرپابوونی یەکێتییەکی عەرەبی دەکەن لەنێوان هەرسێ وڵاتدا (میسر و عیراق و سوریا) بۆ ئەوەی عەرەب لە دژمان بووەستن، بەڵام ئێمە ڕێمان لێگرت و بۆ عەرەبمان سەلماند کە ئێمە لەگەڵ ئەم یەکێتییە و لە چوارچێوەشیداین، چ تێکەڵکردن بێت یاخود فیدراڵی، بەڵام دەمانەوێت لە هەردوو حاڵەتەکەدا پارێزگاری لە مافەکانمان بکەین».

تاڵەبانی وتی: «هەروەها بۆئەوەی ڕای خۆمان زیاتر ڕوونبکەینەوە، خۆم چووم بۆ قاهیرە و شەوکەت عەقراویم لەگەڵدا بوو، لەوێش یەکەمجار چاومان کەوت بە موشیر عەبدولحەکیم عامر، چونکە سەرۆك عەبدولناسر لە کۆنگرەی لوتکەی عەرەبی بوو لە ئەسکەندەرییە، پاش گەڕانەوەشی بینیمان، ئەوەش لە کۆتایی مانگی ئایاردا بوو، داواکارییەکانمان لەگەڵ باسکرد لە بارێکدا ئەگەر یەکێتییەکە دابمەزرێت، دواتر پێمانوت کە ئێمە شەڕ دەستپێناکەین، ئەویش زۆر لێمان تێدەگەیشت و وتی: کارێکی باش دەکەن، کەواتە ئێوە شەڕ دەستپێمەکەن و بە ئاشتییانە و سیاسییانە مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکەدا بکەن، بەمجۆرەش ڕای عەرەب و جیهان بۆ خۆتان ڕادەکێشن. لێرەشدا عەبدولناسر زانیارییەکی گرنگی بۆ ئاشکراکردین و وتی: بەڵام ئەوان (حکومەتی عیراق) بەهەر شێوەیەك بێت شەڕتان لەگەڵ دەکەن، هەر ئەوانیشن کە دەستپێدەکەن».

دوای ئەوە ئامۆژگاری کردم کە نەگەڕێمەوە بۆ بەغدا و وتی: ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ بەغدا دەستگیرتان دەکەن. ئامۆژگاریشی کردم کە بچم بۆ بەیروت و کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی

ڕێکبخەم و ئەمە بڵێم: یەکەم: نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی ڕەسەنە و هەزاران ساڵە لەسەر خاکی خۆی شانبەشانی عەرەب و تورکمان و نەتەوەکانی دیکە دەژی. دووەم: نەتەوەی کورد دژایەتی نەتەوەی عەرەب ناکات، بەڵکو پشتیوانیی دەکات و پشتیوانیی بزووتنەوەی نەتەوەی عەرەب و دامەزراندنی یەکێتیی عەرەب دەکات. سێیەم: ئێمە شەڕمان ناوێت، بەڵکو چارەسەری ئاشتییانە و سیاسییانەمان دەوێت بۆ کێشەی کورد».

بەکردەوە تاڵەبانی بەرەو بەیروت دەکەوێتەڕێ، لە کاتێکدا زانیاری لە بەغداوە پێدەگات کە حکومەت ئەندامانی وەفدی کوردی دانوستانکاری دەستگیرکردووە، لەو بارەیەشەوە دەڵێت: «من نەگەڕامەوە بۆ عیراق و هەموو ئەو ئەندامانەی وەفدی کوردی دانوستانکار کە لەوێ مابوونەوە دەستگیرکران، لە کاتێکدا من چووم بۆ بەیروت، بەپشتیوانی و یارمەتی ناسرییەکان کە دەسەڵاتێکی زۆریان لە لوبنان هەبوو، کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی گەورەم بۆ ڕێکخرا و تێیدا ئەوانەم وت کە سەرۆك عەبدولناسر پێشنیاری بۆ کردبووم».

سەرۆك تاڵەبانی ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە سەرۆك عەبدولناسری کەوتۆتە بەردڵ و دەڵێت: «من سەرسام بووم بە عەبدولناسر، چەند دیدارێك لە نێوانماندا بەڕێوەچوون لەو کاتەوەی کە شەرەفمەند بووم بەناسینی، هەروەها پەیوەندییەکی باشی دۆستایەتی لە نێوانماندا دروستبوو، لام وایە کە ئەویش تێڕوانینێکی باشی لەبارەمەوە لا دروست بوو، تەنانەت تالب شەبیب لەبارەی قسەکانی سەرۆك عەبدولناسر نووسیبووی کاتێك لەسەرەتای دامەزراندنی ئەو حکومەتەی لەنێوان عارف و بەعسییەکاندا دروستبوو، چاویان پێکەوتبوو،

دەڵێت: عەبدولناسر لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و فوئاد عارف کۆبووەتەوە و پێیڕاگەیاندووین کە پێویستە بە پشوودرێژیی و دانایی و دووربینییەوە مامەڵە لەگەڵ هەردووکیان و لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی بکرێت و وتویەتی ئەوەی لە ئێوەی گەنجانی شۆڕشگێڕی عەرەبدا دەیبینم هەر ئەوەیە کە لە جەلال تاڵەبانیدا دەیبینم».

تاڵەبانی وتی: «پەیوەندیم لەگەڵ سەرۆك عەبدولناسر تاکۆتایی بەردەوامبوو، کاتێکیش لە ئەورووپا بووم لەڕێی محەمەد حەسنێن هەیکەلەوە پەیوەندیم پێوە دەکرد، لەو باوەڕەدام کە شتێکی زۆرمان بەدیهێنا و سەرکردەی نەتەوەی عەرەبمان بۆ ڕیزی کێشەی کورد ڕاکێشا، چونکە ئەو بەردەوام بەرهەڵستی جەنگی لە دژی کورد دەکرد، دوای ئەوەش نێردراوێکی کوردی لە قاهیرە قبوڵ کرد هەرچەند حکومەتی عیراق بەرهەڵستی کردنەوەی نووسینگەیەکی بۆ کورد لە پایتەختی میسر دەکرد و داوای داخستنی دەکرد، بەڵام ئەو (عەبدولناسر) ئەوەی ڕەتکردەوە، هەروەها بە ئاشکرا لایەنگری دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی بوو بۆ کورد، ئەمەش بەرەوپێشچوونێکی گەورەبوو لە ڕێچکەی پەیوەندیی عەرەب و کورد بۆیە من بە دۆستی گەلی کوردی دادەنێم، هەروەها بن بیلا و شا حسێن-یش لە سەرکردە عەرەبە هاوسۆزەکان بوون لەگەڵ کێشەی کورد و هەڵوێستیان ڕوون و باش بوو لەبەرامبەر ئێمە».

حکومەتی عیراق لەلایەن خۆیەوە هەوڵیدا تاڵەبانی پەلکێش بکات بۆ بەغدا بەمەبەستی دەستگیرکردنی، ئەویش ئاگاداری ئەوە بوو، لەبەرئەوە توانی فێڵیان لێ بکات و بەردەوام

گەڕانەوەکەی دوابخات و دەڵێت: «کاتێك لە بەیروت بووم چەند پەیوەندییەکم لە حکومەتی عیراقەوە پێگەیشت کە سووربوو لەسەر گەڕانەوەم بۆ بەغدا تا وتووێژەکان تەواو بکەم، منیش بەردەوام پێمدەوتن بەم نزیکانە دێمەوە، بەڵام سەفەرم کرد بۆ ئەوروپا، لەکاتێکدا بەعسییەکان لە 10ی حوزەیراندا شەڕیان دەستپێکردەوە و حکومەتیش ئەم جەنگەی ناونابوو (هاوینەسەیرانێك لە باکوور)، ئامانجەکانیشیان شکستیانخوارد، چونکە لە هەموو ناوچەکانەوە شەڕیان بەرپاکرد و پێشمەرگەی کورد بەتوندی وەڵامیان دانەوە، پاشان لەگەڵ ئێران و تورکیا هاوکارییان کرد بۆ شەڕکردن لەدژی ئێمە».

هەروەها وتی: «لەو نێوەندەدا دەزگاکانمان توانیان بروسکەیەك ئاشکرا بکەن کە بە جفرە لە وەزارەتی بەرگری عیراقەوە نێردرابوو بۆ ئەو هێزانەی عیراق کە لە (کوردستان) باکووری عیراقدا بوون و بروسکەکە دەڵێت حکومەت ڕێگەی داوە بە فرۆکە و هێزی وشکانی تورکیا و ئێران کە ئاسمان و خاکی عیراق ببەزێنن بۆ بەدواداچوونی کوردە یاخیبووەکان، ئێمەش توانیمان ئەم بروسکە بە جفرەنووسراوە ئاشکرا بکەین، چونکە جفرەکە لە گیرفانمدا بوو. پاش ماوەیەك محەمەد حەسنێن هەیکەلم لە یەکێك لە ئوتێلەکانی پاریسدا بینی، پێشتریش بینیبووم کاتێك چووم بۆ قاهیرە بۆ چاوپێکەوتنی سەرۆك عەبدولناسر، منیش باسی بروسکە بە جفرەنووسراوەکەم بۆکرد ئەویش بەلایەوە سەیربوو کە حکومەتی عیراق ڕێگە بدات بە هێزەکانی ئێران و تورکیا خاك و ئاسمانی عیراق داگیربکەن بۆ کوشتنی کورد، منیش بروسکەکەم دایە، کاتێکیش خوێندیەوە بە سەرسوڕمانەوە وتی:

ئەمە زۆر مەترسیدارە ئەگەر بروسکەکە ڕاست بێت، منیش وتم دەتوانن خۆتان لە ڕاستی بروسکەکە دڵنیابن، کاتێکیش لێی دڵنیابوو لە وتارە بەناوبانگەکەیدا (بصراحة) لەسەری نووسی و دەقی بروسکەکەشی بڵاوکردەوە».

لەمیانی ئەم ڕووداوانەدا ئینشیقاقی نێوان عەبدولسەلام عارف و بەعسییەکان ڕووی دا، عارف دەسەڵاتی گرتەدەست و هەڤاڵە بەعسییەکانی خستە زیندانەوە، بەعسییەکان لە ئەدەبیاتی خۆیاندا ئەو کودەتایە ناودەنێن (هەلگەڕانەوەی تشرین)ی ساڵی 1963، ئەم ڕەوشە نوێیە پاڵی بە حکومەتەوە نا کە پەیوەندی بە تاڵەبانییەوە بکاتەوە بەمەبەستی تەواوکردنی دانوستاندن، چونکە هەرکاتێك حکومەتی عیراق هەستی بە لاوازیی خۆی و بەهێزیی کورد کردبێت، بەبیانووی دانوستاندن ڕووی تێکردوون، کاتێکیش حکومەت بەهێز بووبێت ئەوا پەنا بۆ شەڕ لەگەڵ کورد بردووە، ئەم سیاسەتە تەنانەت لە سەردەمی سەدامیشدا بەردەوامبوو، تاڵەبانی دەڵێت: «کاتێك پەیوەندییان پێوەکردم بەمەبەستی درێژەدان بە دانوستاندن، لە ناوچەی چەمی ڕەزان بووم (لە دەوروبەری سلێمانی)، منیش پێموتن وەفدەکەی کورد لەلای خۆتانن لە بەغدا زیندانین، بۆیە لە زیندان دەریانبهێنن و دانوستاندنیان لەگەڵ بکەن و ئیتر پێویستتان بەوە نییە وەفدێکی دیکەتان بۆ بنێرین».

بەڵام هەوڵەکانی حکومەتەکەی عارف لەپێناوی دانوستاندن لەگەڵ سەرکردایەتیی کورد بەردەوامبوو، بەپێی قسەی نووسەری عیراقی سەلاح خەرسان لە کتێبەکەیدا «ڕەوتە سیاسییەکان لە کوردستانی عیراق» کە ساڵی 2001 لە بەیروت دەرچووە، ئەوا «عەبدولسەلام عارف دوای ئەوەی بەعسی لە دەسەڵات لادا، داوای کشانەوەی هێزەکانی سوریا (لیوای یەرموك)ی لە باکووری عیراق و گەڕاندنەوەیانی بۆ سوریا و کردنەوەی کەناڵی پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد کرد لە کانوونی یەکەمی 1963وە، بەدوای ئەوەشدا دانوستاندن هات کە لەلایەنی حکومییەوە عەقید

عەبدولڕەزاق مەحمود پارێزگاری سلێمانی نوێنەرایەتی دەکرد، لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشی کوردیشەوە هەریەك لە مەلا مستەفا بارزانی و شێخ ئەحمەد بارزانی برا گەورەی و جەلال تالەبانی و نوری شاوەیس ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان نوێنەرایەتییان دەکرد و بە ڕێککەوتنێك کۆتاییهات کە مەلا مستەفای بارزانی بەوپێیەی سەرکردەی شۆڕشی کورد بوو، ئیمزای کرد». لە 10ی شوباتی 1964یشدا عەبدولسەلام عارف سەرۆك کۆمار داوای کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەڵ ئەنجومەنی سەرکرایەتی شۆڕش و کۆبوونەوەکەش پاشنیوەڕۆ کرا و عەقید عەبدولڕەزاق مەحمودیش ئامادەیبوو، ڕازیبوونی مەلا مستەفای بارزانی بە ڕاگرتنی شەڕ ڕاگەیاند و کاغەزێکی بچووکی دەرهێنا کە بەخەتی مەلا مستەفا نووسرابوو ئەوەی دەسەلماند».

هەروەها خەرسان لە کتێبەکەیدا ئەوەش دەڵێت: «دوای کۆتاییهاتنی کۆبوونەوەکە بەیاننامەیەك بەناوی موشیری ڕوکن عەبدولسەلام عارف سەرۆك کۆمارەوە دەرچوو کە تێیدا گەیشتن بە ڕێککەوتنی لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی ڕاگەیاند و نامەیەکی ئەمیش بەهەمان ناوەرۆك بڵاوکرایەوە».

کەسانێك هەن ئەوە دووپاتدەکەنەوە کە ئەم ڕێککەوتنە بووەهۆی ئینشیقاقی مێژوویی نێوان مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری مەکتەبی سیاسی حزب، بەگوێرەی قسەی خەرسان «دوای ئەوەی ئاگربەست چووە بواری جێبەجێکردنەوە، ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ عەزیز شەمزینی و عومەر مستەفا (دەبابە) ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بەپەلە ئەو گەشتەیان کۆتایی پێهێنا کە لە ئەوروپا ئەنجامیان دەدا و لەڕێی ئێرانەوە گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی

ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کورد و هەڵمەتێکی بەرفراوانیان لە دژی ئەو ڕێککەوتنە ئیمزاکراوەی نێوان سەرۆکی حزب و سەرۆك کۆمار دەستپێکرد، بیانووشیان لەوەدا ئەوەبوو کە کەمترین ئاستی داواکارییەکانی شۆڕشی کورد جێبەجێ ناکات».

ئەو هەڵوێستەش بووەهۆی دروستبوونی درزێك لە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و دابەشبوونی بۆ دوو باڵ، یەکەمیان باڵی بارزانی و دووەمیش باڵی ئیبراهیم ئەحمەد، باڵی یەکەمیش ناونرا (پارتی دیموکراتی کوردستان – مەکتەبی عەسکەری بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا بارزانی و دوومیش ناونرا (پارتی دیموکراتی کوردستان – مەکتەبی سیاسی) کە ئیبراهیم ئەحمەد سەرۆکایەتی دەکرد و جەلال تاڵەبانیشی لەگەڵدا بوو.

کاتێکیش لە سەرۆك تاڵەبانیمان پرسی باسی ئەم ئینشیقاقە و هۆکارەکانیمان بۆ بکات دوای تێپەڕبوونی 45 ساڵ لە ڕوودانی، وتی: «لە زیاتر لە 14 دەفتەری تێبینی گەورەدا هەموو بیرەوەرییەکانم نووسیوەتەوە و بەهۆی ئەم ناکۆکییەوە بڵاوم نەکردوونەتەوە کە ئێستا کێشە دەنێتەوە، پێم باشە ئەمڕۆ ئەوە دوابخەین، بەڵام دەتوانم تەنیا ئەوەبڵێم کە ئەم ناکۆکییە نەدەبووایە ڕوویدات، ئەرکی منیش بوو کار بۆ گونجاندنی تەواو بکەم لە نێوان مەکتەبی سیاسی و سەرۆك بارزانیدا، ئەم ناکۆکییە شۆڕشی کوردی زۆر لاواز کرد هەروەك کاریگەری بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستانیشەوە بەجێهێشت». ئاماژەی بۆ ئەوەشکرد بۆ دواجار سەرۆك بارزانی لە ساڵی 1971دا بینییەوە.

هەندێك ناوەندی کوردی هۆکاری لایەنگری تاڵەبانی بۆ ئیبراهیم ئەحمەد بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە کاریگەریی لەسەری هەبووە، مام جەلالیش ئەم مەسەلەیە ناشارێتەوە و دەڵێت:

«زۆربەی لاوانی کورد سەرسامبوون بە ئیبراهیم ئەحمەد، چونکە کەسایەتییەکی سیاسی ڕۆشنبیری فیکری ئەدەبی کوردی ناسراوە، لە لاویدا لە کۆلێجی حقوق وەك ڕۆشنبیرێکی کورد دەرکەوت کە زمانی ئینگلیزی دەزانی لە پاڵ کوردی و عەرەبیشدا، هەروەها شاعیر و چیرۆکنووس و یەکەم ڕۆماننووسی کوردیشە، لە نێوان ساڵانی 1939 و 1949دا یەکەم گۆڤاری ڕۆشنبیری کوردی نیشتمانی دەرکرد و ناوی نا (گەلاوێژ)، ئەم گۆڤارە یەك دەیەی تەواو خزمەتی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردی کرد، چاکەی گەورەشی هەبوو لە گەشەکردنی زمان و شێوازی نووسین و پاککردنەوەی زمانی کوردی لە پیتی بێگانە و زمانی کوردی هاوچەرخیش لەگەڵ ئەودا دەستیپێکرد، ئەو بیری چەپڕەوانە بوو و خۆشەویستە لەلای ڕۆشنبیران و هەموو خەڵکیش، تەنانەت لە ناوەندە عەرەبی و عیراقییەکانیشدا ناسراوە، لە ساڵی 1954دا لەلایەن چەپڕەوە عیراقییەکانەوە (انصار السلام) خەڵاتی ئاشتی عیراقی (ئەستێرەی زێڕین)ی پێبەخشرا. ماوەیەکیش، کاتێك گۆڤارەکەیمان دەخوێندەوە ئومێدمان دەخواست بەکردەوە بیبینین».

بەبۆنەی باسی خوێندنەوەوە، بە سەرۆك تاڵەبانیم وت: «هەر کاتێك بەتەنیا دەتبینم تێبینی دەکەم کتێبێکت بە دەستەوەیە، ئایا کاتی خوێندنەوەتان هەیە؟». لە وەڵامدا وتی: «دەمخوێندەوە و ئێستاش دەخوێنمەوە، لە منداڵیمەوە حەزم لە خوێندنەوەیە ئەو کاتەی لە کتێبخانەی کۆیە ناوم تۆمارکرد و جارێکیش لە کتێبخانەی کۆیی، ئەم خواستەم لە خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی گەشەیکرد و پاشان زانکۆ و تەنانەت لە کۆلێجی ئیحتیات و پاشان دوای تەواوکردنی خزمەتیش، چونکە دوای ئەوە وەك موحەریر لە ڕۆژنامە کارمکرد، ئەوسا و ئێستاش کتێبم هەر

پێیە، هەمیشە کتێبی مارکسیی و چەپڕەوی و ئەوانەشم دەخوێندەوە کە عیراقییەکان لە کتێب و وتار دەیاننووسی. بۆ نموونە ئەمڕۆ من شەش کتێبخانەم هەیە، لەوانە کتێبخانەیەکیان گەورەیە لە ماڵەکەی خۆمدایە لە سلێمانی، یەکێکی دیکەش لە شوێنی نیشتەجێبوونم لە بەغدا، سێیەمیش لە نووسینگەکەم لە سەرۆکایەتی کۆمار، کتێبخانەیەکی بچووکیش ئەو کتێبە گرنگانەی تێدایە کە بە بەردەوامی پێویستم پێیانە لەو نووسینگە بچووکەدایە کە تێیدا چاوم بە میوان و ڕۆژنامەنووسان دەکەوێت لە نووسینگەی سەرۆکایەتی، کتێبخانەیەکیش لە بارەگای پشوودانم لە هاوینەهەواری دوکان، کتێب هەیە لەنێوان بەغدا و سلێمانی لەگەڵ خۆم دەگوازرێنەوە، هی دیکەش هەن بەگوێرەی نەخشەی هاتوچۆکانم دابەش بوون، ئەم کتێبخانانە ناونیشانی جیاجیان تێدایە لە زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی، بابەتەکانیشیان دابەش بوون بەسەر مێژوویی و سیاسی و ژیاننامە و بێگومان دیوانەکانی جەواهیری لەگەڵ زۆر لە دیوانی شاعیرانی عەرەب و کورد دا، ناتوانم بەهیچ جۆرێك بخەوم چەندە هیلاکیش بم ئەگەر بۆ ماوەی سەعاتێك یان کەمتر نەخوێنمەوە، هەر دەرفەتێکیش هەبێت لەکاتەکانم دەیقۆزمەوە بۆ خوێندنەوە».

تاڵەبانی سەرقاڵی کاری حزبی بووە و تەنانەت خۆی و ڕێکخستنی ژیانیشی لەبیرچووبووەوە و ئاگای لە مەسەلەی ژنهێنان نەمابوو، ئەوانەی لەم خاڵەش ئاگاداریان کردەوە هەڤاڵەکانی بوون لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، بە زەردەخەنەوە باسی ئەم مەسەلەیە دەکات و دەڵێت: «ژنهێنانم لە شار بوو نەك لە شاخ، بەڵام ساڵانێکی دوورودرێژی ژیانمان لە شاخ بەسەربرد، بەبڕیارێکی سیاسیش بوو، چونکە بینییان هێشتا سەڵتم بۆیە

پێشنیاریان کرد کە داوای هێرۆخان کچی ئیبراهیم ئەحمەدم بۆ بکەن، خان نازناوێکی ڕێزگرتنە لە ژنان و لە وشەی تورکی و فارسی (خانم)ەوە وەرگیراوە، چونکە وا بەباشدەزانرێت کە ڕاستەوخۆ بەناوی خۆیەوە بانگ نەکرێت، ئەویش هێرۆخان بوو کە کچێکی لاوی ڕۆشنبیر و عاقڵە، ئەو کاتە خوێندکاربوو لە زانکۆی موستەنسریە لە بەغدا، بۆیە وەفدێکی مەکتەبی سیاسی چوون بۆ ئەوەی بۆم داوابکەن لە باوکی، بێگومان من دەمناسی، چونکە زۆرجار سەردانی ماڵی ئیبراهیم ئەحمەدمان دەکرد بەوپێیەی سکرتێری مەکتەبی سیاسی و مامۆستاشمان بوو، لە ساڵی 1958وە دەیانناسم، داواکردنەکە بە ئەنجام گەیشت بەڕەزامەندی باوکی و مارەکردنەکەش ئەنجامدرا، چاوەڕوانمان کرد تا لە زانکۆ دەرچوو، پاشان بووینە هاوسەر و چووین بۆ شاخ و بەدرێژایی تەمەنیشمان پێکەوە لە شاخ بووین».

هێرۆخان دەڵێت: «لە شاخ لە 1979ەوە تا 1991 لە کامپی پێشمەرگەدا دەژیاین، ژیانم زۆر سەخت بوو، چونکە لە نێو جانتایەکی گەڕۆکی سەفەردا دەژیاین، نەماندەزانی لە کوێ و کەی دەوەستین و کەی دەڕۆین». لە کاتێکدا تاڵەبانی باسی ژیانی لە شاخ دەکات و دەڵێت: «ژیان لە شاخ بۆمن سەخت نەبوو، چونکە خەبات و شەڕ لەپێناوی کێشەیەکی پیرۆزدا کە باوەڕمان پێیەتی فێنکی و شادمانی و ئاسوودەیی ویژدان دەبەخشێت، کوخێکی قوڕیشمان هەبوو کە تێیدا دەژیاین لە ناوچەیەك ناوی (ناوزەنگ)ە لە نزیك گوندی (شێنێ) لەوپەڕی سنووری سلێمانی، دوو کوڕیشمان بوو کە ئەوانیش بافڵ و قوباد-ن، لەلای هاوسەرەکەی ئیبراهیم ئەحمەد دایکی هێرۆی هاوسەرم بەجێمانهێشتن، کە لە لەندەن بەخێوکردنیانی لە ئەستۆگرت لە لەندەن، هێرۆخانیش لە شاخ

ئەرکی ڕاگەیاندنی جێبەجێ دەکرد و ڕۆڵی پەیامنێری جەنگی دەگێڕا، وێنەی فۆتۆگرافی دەگرت و بەکامێرای ڤیدیۆ وێنەی دەگرت، بەدۆکیۆمێنتیش شەڕەکان و ژیانی پێشمەرگەکانی لە شاخ دەنووسیەوە».

هەروەها تاڵەبانی وتی: «کاتێك گەڕاینەوە بۆ عیراق نەمانتوانی بچینە دەرەوە و سەفەری دەرەوە بکەین تا دوای ئەوەی ڕژێمی شا ڕووخا و شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران ڕوویدا ئەوسا توانیمان سەفەر بکەین، بۆیە کاتێك بەیروتم بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆ نیشتمان، هێرۆی هاوسەرم لە نەخۆشخانە بوو لە چاوەڕوانی لەدایکبوونی کوڕی دووەمماندا، لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە ئەگەر کوڕ بێت ناوی بنێین قوباد و ئەگەر کچیش بێت ئەوا هاوسەرەکەم بە ئارەزووی خۆی ناوی بنێت، نەمزانی خوا کوڕێکی پێداوین دوای ماوەیەك نەبێت، قوبادم نەبینی تا شا لە ئێران ڕۆیشت، لێرەدا باسی ڕووداوێکی خۆش دەکەم، چونکە دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران لەڕێی تارانەوە سەفەرمکرد بۆ لەندەن بۆ سەردانی هەڤاڵان و ئیبراهیم ئەحمەد و بینینی کوڕەکەم کە لەدایکبوونیەوە نەمدیبوو، هێرۆی هاوسەرم ئامۆژگاریکردم کە لەگەڵ خۆم دیارییەکی بۆ ببەم، منیش وتم باشە، بەهۆی سەرقاڵیم و کۆبوونەوەشەوە نەمتوانی دیارییەك بۆ قوباد بکرم، ئیتر وتم کە گەیشتمە لەندەن دەیبەم بۆ بازاڕ بۆ ئەوەی خۆی چی دەوێت بیکڕێت، گەیشتمە لەندەن تاکسییەکم گرت بۆ ماڵی ئیبراهیم ئەحمەد کە قوباد لەوێ لە ئامێزی باپیر و نەنکیدا دەژیا، لە دەرگامدا قوباد دەرگاکەی کردەوە و ئینجا ڕایکرد پێیوتن: پیاوێك لە بەر دەرگایە، چوومە ژوورەوە و بەخێرهاتنیان کردم و قسەمانکرد و قوبادیش لەبەر دەممدا

دانیشتبوو، نەنکی و بافڵ-ی برا گەورەی وتیان ئەوە باوکتە بچۆ سەلامی لێبکە، ئەویش لێم ورد بووەوە و لەبارەی دیارییەکەی لێی پرسیم، من وتم دەچین بۆ بازاڕ و تۆ دیارییەکە هەڵبژێرە، ئەویش وتی: ئەمە چییە.. پیاوێك هاتووە و دەڵێت من باوکتم و دیاری پێ نییە؟! پاشان بووینە هاوڕێ و تائێستاش هەروایین، چونکە پەیوەندیم بە هەردوو کوڕەکەمەوە زۆر باشە و وەك هاوڕێ مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەین».

له 25ی ئایاری 1975دا چوار سەرکردەی پارتی دیموکراتی کوردستان کە جەلال تاڵەبانی و فوئاد مەعسوم و عادل موراد و عەبدولڕەزاق میرزا بوون لە قاوەخانەی تولەیتەلەی ناوەڕاستی دیمەشق کۆدەبنەوە بۆ تاووتوێکردنی ڕەوشی شۆڕشی کورد کە ڕاوەستابوو بەهۆی ئەو ڕێککەوتنەی لە نێوان محەمەد ڕەزا پەهلەویی شای ئێران و سەدام حسێن جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عیراق لە ساڵی 1975 لە جەزائیر ئیمزاکرا و بووە مایەی ئەوەی شای ئێران پشتیوانیکردنی بۆ شۆڕشی کورد لە عیراق ڕابگرێت.

پاش تاووتوێکردنێکی دووروودرێژ ئەو چوار هەڤاڵە بڕیاری دامەزراندنی هاوپەیمانێتییەکی سیاسی نوێ دەدەن نەك حزب، بەناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە و سووربوونی خۆیان دەردەبڕن بۆ گەڕانەوە بۆ ناو شۆڕش و خەباتی چەکداریی لە شاخ لە پێناوی مافەکانی گەلی کورد و کێشەی کورددا.

ئەمە لەکاتێکدابوو کە سەدام حسێن گاڵتەی بەم جۆرە پێکهاتە سیاسییە نوێیە دەکرد کە کاریگەریی خۆی بەسەر مێژووی عیراق و گەلی کوردەوە هەبوو، ڕستە بەناوبانگەکەی دەڵێت «ئەگەر دارخورمایەك لەسەری جەلال تاڵەبانی بڕوێت، ناتوانێت شەش چەکدار بباتە شاخ». بەوپێیەش کە دووەم قەوارەی سیاسی کوردی عیراقییە لەڕووی مێژووی دامەزراندنەوە، ئەوا سەرۆکی پێشووتری عیراق دواتر دان بەم پێکهاتەیەدا دەنێت و لەگەڵ سەرکردەکـــانیدا دادەنیشێت و گفتوگـــۆیان لەگـــەڵ دەکات بۆ دۆزینەوەی چـــارەسەرێك بۆ کێشەی کورد.

بەڵام لە سایەی ڕاوەستانی شای ئێران و تورکەکان لەدژی شۆڕشی کورد لەو کاتەدا، کێ پشتیوانیی ئەم ڕێکخراوە سیاسییە

کوردییە نوێیەی کرد؟ تاڵەبانی دان بەوەدا دەنێت کە سێ دەوڵەت پشتیوانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیان کردووە کە ئەوانیش لیبیا و سوریا و یەکێتیی سۆڤێت بوون.

مام جەلال ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بایەخی بە پۆست و ناوونیشان نەداوە، تەنانەت کاتێکیش ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە بە شوێنی خۆی ڕازی بووە و دانیش بەوەدا دەنێت: «ڕازی بووم بە شوێنەکەم و بگرە وا هەستم دەکرد ئەوەی منی تێدام شوێنێکی گەورە و زۆر زۆرە وەك ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی لە پارتی دیموکراتی کوردستاندا، من لەو کەسانە نیم کە بەدوای پۆستدا دەگەڕێن و ناوونیشانیشم بەلاوە گرنگ نییە، تەنانەت کاتێك یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیشمان دامەزراند، وەك دەستەی دامەزرێنەر پێشنیارم کرد ناوونیشانەکان لاببرێن، وەك سکرتێری گشتی یاخود ئەمینداری گشتی حزب و شتی لەو جۆرە، هەمووومان یەکسان بووین تا گەڕاینەوە بۆ ناو عیراق و شەڕی شاخ ئەو کاتە دەبووایە ئەم ناوونیشانانە هەبن و ئەرکەکانی سەرکردایەتی دابەش بکرێن، پاش دەستپێکردنەوەی شۆڕشی کورد بە سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی هەڵبژێردرام و عەلی عەسکەری بە فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگە هەڵبژێردرا».

تاڵەبانی دەڵێت: «یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە سێ ڕێکخراو پێکدەهات کە بریتی بوون لە کۆمەڵەی ڕەنجدەران کە نەوشیروان مستەفا نوێنەرایەتی دەکرد و سۆسیالیستی دیموکرات کە هێڵی سەربازی سەر بەو بوو، نیشتمانیش کە من سەر بەوەیان بووم، هەروەها دکتۆر فوئاد مەعسوم و کەسانی دیکەی گروپەکەش، بەکۆی دەنگ بەسکرتێری گشتی حزب هەڵبژێردرام کە ئەم پۆستە

دوای دوو ساڵ لە دامەزراندنی یەکێتیی دانرابوو، پێش ئەوەش پۆست یاخود ناوونیشان نەبوو».

تاڵەبانی باسی هەلومەرجی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و هۆکارەکانی ئەو دامەزراندنە دەکات و دەڵێت: «دامەزراندنی یەکێتیی دوای ئەوە هات کە مەلا مستەفای بارزانی پارتی دیموکراتی کوردستانی هەڵوەشاندەوە و شۆڕشی ڕاگرت لە ئەنجامی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لەنێوان شای ئێران و سەدام حسێندا لە ساڵی 1975 کە ئامانجی تێکشکاندنی شۆڕشی کورد بوو، ئێمەش ئەندام بووین لە پارتی دیموکراتی کوردستاندا پرسیمان: ئایا درێژە بە خەباتی سیاسی و چەکداریی بدەین لەپێناوی کێشەی کورددا یان بێدەنگ بین؟ ئێمە لە دەرەوەی عیراق چەند کەسێك بووین، من و دکتۆر فوئاد مەعسوم و عادل موراد کە سکرتێریی یەکێتیی قوتابیانیی کوردستان بوو و عەبدولڕەزاق میرزا ڕێککەوتین لەسەر درێژەدان بە خەبات و وتمان: دەبێت بەشێوەیەکی تازە کاربکەین و سوود لە هەڵەکانی ڕابردوو وەربگرین بەجۆرێك یەکێتیی نیشتمانیی ڕێکخراوێکی بەرەیی بێت نەك حزب و ڕەوتی جیاجیا لەخۆبگرێت و پشت بە گەل ببەستێت نەك بە پەیوەندییە هەرێمایەتییەکان و خاوەنی بیرێکی چەپڕەوانە بێت و خەباتی جەماوەریی چەکداریی بکاتە ڕێگایەك بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی کێشەکەمان و لە یەك کاتدا هاوکاریی لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازە عیراقی (عەرەبی) و کوردستانیەکان بکەین، ئەمانە لە بەیاننامەی یەکەمی یەکێتییدا هەبوو کە لە 22ی ئایاری 1975دا لە قاوەخانەی توڵەیتەلە لە دیمەشق نووسیمان».

تاڵەبانی بەردەوام دەبێت لە یادکردنەوەی ئەو لەدایکبوونە سیاسییە و دەڵێت: «تەنیا چوار کەس بووین کە یەکێتیمان دامەزراند پاشان پەیوەندییمان کرد بە هەڤاڵەکانمان لە ئەورووپا و

دکتۆر کەمال فوئاد و نەوشیروان مستەفا و عومەر شێخ موس هاتنەپاڵمان و بەمجۆرە بووینە حەوت ئەندام وەك دەستەی دامەزرێنەر و گەڕاینەوە بۆ نیشتمان و یەکێتیی فراوانبوو و ڕەوت و کەسایەتییەکانی دیکەش هاتنە پاڵمان».

هەروەها وتی: «پێمانوابوو کە پێداویستییەکانی خەباتی سیاسی و تێکۆشانی جەماوەریی چەکداریی لە کوردستاندا هەن و سەرکەوتوو دەبین و ئامانجەکانمان دەهێنینە دی و سەرکردایەتیش ئیجتیهادێکی هەڵەی کردووە کاتێك شەڕی ڕاگرتووە، لە کاتێکدا ئێمە باوەڕمان بەوە هەبووە کە دەبووایە خەباتی چەکداریی بەردەوام بێت و سەرکەوتنەکانی بهێنێتەدی، لەبەرئەوە زۆر لە سەرکردەکان و بنەکەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان هاتنە ڕیزەکانمانەوە».

لە وەڵامی ئەو تۆمەتەش کە دەڵێت دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی ئینشیقاقێکی تەواوبوو لە جەستەی پارتی دیموکراتی کوردستان، تاڵەبانی دەڵێت: «ئێمە -چوار کەسە دامەزرێنەرەکەی یەکێتیی- لە سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بووین و بنکەی پارتیش چ لە پێشمەرگە یاخود جەماوەر ئەوانەی باوەڕیان بە پێویستی درێژەدان بە خەبات هەبوو هاتنە ڕیزەکانمانەوە، ئێمە ئەوە بە ئینشیقاق دانانێین بەڵکو درێژەدانە بە ڕێگای شۆڕشی کورد، لەو ڕوانگەیەوە سەیری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەکەم کە لە پارتی دیموکرات و شۆڕشی کوردەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە من خۆم ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بووم لە پارتی (پارتی دیموکراتی کوردستان) و لە 1947وە تا 1975 ئەندامی حزب بووم، واتە نزیکەی سی ساڵ، ئەو کەسەش کە دەڵێت یەکێتیی نیشتمانیی بزووتنەوەیەکی جوداخواز بووە ئەوا دەبێت ڕوونیبکاتەوە چۆن و بۆچی؟ چونکە پارتی دیموکرات لەلایەن سەرۆك بارزانییەوە هەڵوەشێندرایەوە و شەڕ بەتەواوی

ڕاوەستا و دەبووایە بزووتنەوەیەکی سیاسیی ڕێبەرایەتی خەباتی جەماوەریی چەکداری بکات».

بەڵام حکومەتی عیراق چۆن پێشوازیی لە هەواڵی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کرد؟ چونکە ئەو حکومەتە باوەڕی نەدەکرد کە شۆڕشی کورد کۆتایی بێت ئیتر چۆن ئەم جۆرە قەوارە سیاسییە کوردیە نوێیە دەچووە ئەقڵیەوە؟ تاڵەبانی بە کورتی وەڵامدەداتەوە و دەڵێت: «حکومەتی عیراق گاڵتەی بە یەکێتیی و درێژەدان بە خەباتی چەکداریی دەهات»، هەروەها بەردەوامدەبێت و کاردانەوەی سەدام حسێنی بیر دەکەوێتەوە و دەڵێت: «ئەو کاتە پەیوەندییەکی پتەوم لەگەڵ دکتۆر جۆرج حەبەش هەبوو کە پەیوەندییەکی دۆستایەتی و بەتایبەتی نزیکایەتی فیکری پێکەوەمان دەبەستێتەوە و بۆ ماوەی ساڵانی 1970 و 1971 لەڕێی بەرەی میللیەوە لەگەڵ مقاوەمەی فەلەستینیدا کارم کردووە، حەبەش پیرۆزبایی ئەم هەنگاوەی لێکردین و ستایشی ئەوەی کرد کە درێژەمان بە خەبات و تێکۆشانی چەکداریی داوە، هەر ئەویش بوو کە پێشنیاری کرد گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عیراقدا دەستپێبکەین و چاومان پێیان بکەوێت، لەبەرئەوە حەبەش ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە لەلای سەدام حسێن مەسەلەی دیدار و گفتوگۆی لەگەڵ ئێمە باس کردووە، بەڵام سەدام پێیوتووە: ئەگەر دارخورمایەك لەسەری جەلال تاڵەبانی بڕوێت، ناتوانێت شەش چەکدار لەگەڵ خۆی بباتە شاخ، بەڵام دوای کەمتر لە ساڵێك لە دامەزراندنی یەکێتیی و لە ساڵی 1976دا سەرلەنوێ لەڕێی یەکەی بچووکەوە شەڕمان دەستپێکردەوە و وردە وردە فراوانبووین و چالاکییە سەربازییەکانیشمان فراوانبوون».

سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئەوەش ئاشکرا دەکات کە سێ دەوڵەت پشتیوانی یەکێتییان کردووە لە ڕووی ماددیی و سەربازی و سیاسییەوە و دەڵێت: «کاتێك یەکێتیی

نیشتمانیی دامەزرا پشتیوانییەکی لیبیایی و سوریاییمان هەبوو، هەروەها پشتیوانییەکی سیاسیمان هەبوو لەلایەن یەکێتیی سۆڤێتەوە. پشتیوانییەکەی لیبیا ماددی (پارە) بوو ئەوەی سوریاش سەربازی بوو بە مەشقکردن و پڕچەککردن و سەربازگەی مەشقکردنمان لە سوریادا هەبوو، یەکێکیان لە نزیك دیمەشق و دووەمیشیان لە قامیشلی، هەندێك جاریش سوریا پشتیوانیکردووین بە بڕێك پارە لەگەڵ چەکی خۆڕاییدا».

تاڵەبانی باسی چیرۆکی پشتیوانی لیبیا و سوریا و هۆکارەکانی دەکات و دەڵێت: «بەر لە دامەزراندنی یەکێتیی هەردوو سەرۆك حافز ئەلئەسەد و موعەمەر قەزافی-م دەناسی، لەسەر بانگهێشتی خۆی سەردانی قەزافیم کرد و لەوێ پارەیان خستەبەردەستم بۆ پشتیوانیکردنی کێشەی کورد، منیش پێموتن ئێستا نە حزبم هەیە و نە چەکدار و پێویستم بە پارە نییە و ئەوەی کە هەمە بەسمە، بەڵام ئەگەر پێویستمان بە پارە هەبوو بۆ خەبات ئەوا داوای پشتیوانیتان لێدەکەم، بەکردەوەش دوای دامەزراندنی یەکێتیی چووم بۆ لیبیا و پێموتن ئێمە ئێستا پێویستمان بە پشتیوانی ئێوەیە ئەوانیش وتیان بەسەرچاوان و لێیان پرسیم کە چیمان پێویستە، منیش وتم مانگانە پێویستمان بە (50) هەزار دیناری لیبیاییە، ئەوانیش بڕیاریاندا هەموو مانگێك ئەو بڕە پارەیەمان بدەنێ تا ئەو کاتەی مەسەلەکە ئاشکرابوو کاتێك عەبدولسەلام جلود سەردانی بەغدای کرد و بەڵگەنامەیەکیان خستە بەردەمی کە ئەوەی دەسەڵاند لیبیا یارمەتی دارایی داوین، بۆیە ماوەیەك ڕایانگرت و پاشان ئەو پشتیوانی کردنەیان بۆ دەستپێکردینەوە».

سەبارەت بە پشتیوانیی ڕوسیاش، تاڵەبانی وتی: «هەرچی پشتیوانی یەکێتیی سۆڤێتیشە ئەوا لەڕێی پریماکۆفەوە بوو کە دواتر بووە سەرۆکی حکومەت لەو وڵاتە، شارەزابوو لە مەسەلەی کورددا و من خۆم دەمناسی، چونکە لە کۆتایی شۆڕشی یەکەمی کورددا کاتێك دانوستاندن لەنێوان عیراق و ئێراندا لە ئەستانبوڵ بەڕێوەچوو "نیشانەکانی ڕێککەوتن دەرکەوتن" من لە قاهیرە دەژیام، ڕۆژێکیان مستەفا جاف-ی هاوڕێم لە بەیروتەوە پەیوەندی پێوەکردم و وتی: هاوڕێیەکی بیانیت هەیە و دەیەوێت بتبینێت و زۆرگرنگە بەزووترین کات بێیت بۆ بەیروت بۆ بینینی، بەکردەوەش ڕۆژی دواتر سەفەرمکرد بۆ بەیروت و ڕاستەوخۆ چووم بۆ ماڵی مستەفا جاف و لەوێ بینیم پریماکۆڤ دانیشتووە و ڕاستەخۆ بردمیە دەرەوەی ماڵەکە و پێیوتم: ئێمە دەزانین کە ڕێککەوتن لەنێوان عیراق و ئێراندا دەکرێت و شا لەدژی ئێوە دەوەستێت و پشتیوانیتان لێدەبڕێت و ئێوەش ئەوە دەزانن، ئینجا درێژەیدایە و وتی: ئەمە ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستیی ئەمریکا دۆستی ئێوە نین، بەڵکو تەنیا یەك دۆستتان هەیە کە ئەویش یەکێتیی سۆڤێتە و ئەو پێشنیارەی بۆکردم کە شەڕ کۆتایی پێنەهێنین و وتی: ئێمە ئامادەین بۆ یارمەتیدان و پشتیوانیکردنتان بەتەواوی وەکو جاران و پێش ئەوەی پەیوەندی نێوانمان بپچڕێت، ئێمە ئێستا پەیوەندیتان لەگەڵ دروست دەکەینەوە، بەڵام بەمەرجێك درێژە بەشەڕ بدەن، چونکە یەکێتیی سۆڤێت پەیوەندی بە شۆڕشی کوردەوە پچڕیبوو لە دوارۆژەکانیدا ئەوکاتەی کە تەنیا پارتی دیموکراتی کوردستان هەبوو،

پێشنیاریشی بۆکردم کە نامەیەك بۆ هەردوو برا ئیدریس و مەسعود بارزانی بەو مانایە بنووسم، واتە یەکێتیی سۆڤێت وەکو جاران پشتیوانیکردنمان دەستپێدەکاتەوە بەمەرجێك درێژە بەشەڕ بدەین».

تاڵەبانی هەروا وتیشی: «بەکردەوە نامەکەم نووسی و ناردم بۆ هەردوو برا ئیدریس و مەسعود بارزانی کە ئەوکاتە هێشتا لە سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستاندابووم لە لوبنان و میسردا نیشتەجێبووم و ئەندامیش بووم لە پەیوەندییە دەرەکییە عەرەبییەکانی حزبدا و دکتۆر فوئاد مەعسومیشم لەگەڵدابوو، بەڵام سەرکردایەتی کورد هانی ئەم جۆرە هەنگاوەی نەدا. کاتێکیش یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دامەزرا پەیوەندیمکرد بە پریماکۆڤەوە و دیداری لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتیی سۆڤێت بۆ ڕێکخستم و بەشێوەیەکی نهێنی چووم بۆ ئەوێ و پێموتن کە درێژە بەشەڕ دەدەینەوە لـــەڕێی یەکێتیی نیشتمانییەوە، جەختیان لە پێویستی درێژەدان بەشەڕ دەکردەوە و کەسێکیان بۆ دەستنیشانکردین کە لە لوبنان لەڕێی ئەوەوە پەیوەندی بکەین، ئەوان ئەمجارە یارمەتی ماددییان پێشکەش نەکردین، بەڵکو پشتیوانیی کردنەکەیان تەنیا سیاسی بوو».

تاڵەبانی وتی: «لەڕاستیدا لەلایەن ئێران و تورکیا و عیراقەوە ئابڵوقە درابووین و هیچ پەنایەکمان نەبوو شاخ نەبێت. هەر لەو ساڵەدا کە شەڕمان دەستپێکرد پارتی دیموکراتی کوردستانیش گەڕایەوە بۆ شەڕ، بەڵام پەیوەندیمان باشنەبوو لەگەڵیاندا و بەداخەوە پەیوەندیمان خراپبوو، هەرچەندە لەوکاتەدا لەگەڵ برامان مەسعود

بارزانی ڕێککەوتین لەسەر هاوکاریکردن ئەویش لەمیانی دیدارێکدا کە لە سوریا بەڕێوەچوو، بەڵام بەداخەوە ئەم هاوکاریکردنە سەرینەگرت».

یەکێتی نیشتمانیی شەڕی لەدژی هێزەکـــانی حکـــومەت دەستپێکردەوە، بەڵام تاڵەبانی دەڵێت: «بەرلەوەی شەڕ دەستپێبکەین چەند گرووپێکمان هەبوو دەچوون بۆ گوند و ناوچـــــە شاخاوییەکان بە مەبەستی هۆشیارکردنەوە و ڕۆشنبیرکردن سەبارەت بەبوونی یەکێتیی و دەستپێکردنەوەی شەڕ و خەباتی چەکداریی، پاش ساڵێکیش لە دامەزراندنی یەکێتیی بە چەند گرووپێکی بچووك شەڕمان لە ناوچەکانی هـــەڵەبجە و بادینان و هەولێر دەستپێکرد، دواتـــر ئەم گـــــرووپانە فراوانبوون و ژمارەیەکی زۆر چەکداریان لەخـــۆدەگرت و دەستمانکرد بە پەلاماردانی هێزەکانی حکومەت و بەشێوەیەکی سەرەکیش جاشەکان، منیش دوای ئەوە بـــەساڵێك گەڕامەوە بۆ نیشتمان و لە شاخ بووم کە پەناگەیەکمان نەبوو، چونکە ئێران و تورکیا و حکومەتی عیراق لە دژمان بوون».

تاڵەبانی ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە خۆی یان هیچ ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان چاویان بە سەدام حسێن کەوتبێت یاخود گفتوگۆیان لەگەڵ کردبێت و دەڵێت: «بارزانی لە حەفتاکاندا دانوستاندنی لەگەڵ کردن و ئەوەش ئیمزاکردنی ڕێککەوتنی ئاداری لێ کەوتەوە، ئێمە بەشداریمان لەم دانوستاندنانەدا نەکرد، بەڵام پشتیوانیمان لێکرد، پاشان لەباربران».

له11ی ئاداری 1970دا ڕێککەوتنی ئۆتۆنۆمی کورد لەنێوان حکومەتی عیراق و مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەی کورد ئیمزاکرا و تێیدا حکومەتی عیراق دانی بە مافە نەتەوایەتییەکانی کورددا نا و گرەنتی بەشداریکردنیشی پێدان لە حکومەتی عیراق و بەکارهێنانی زمانی کوردی لە دامەزراوەکانی خوێندندا، بەڵام نەگەیشتنە چارەسەرێکی یەکلاکەرەوە سەبارەت بە کێشەی کەرکوک کە بە هەڵپەسێردراوی مایەوە لە چاوەڕوانی ئەنجامی سەرژمێریدا تا ڕێژەی نەتەوە جیاجیاکان لە شاری کەرکوکدا بزانرێت.

دەبووایە سەرژمێری لە کەرکوك لە ساڵی 1977دا ئەنجامبدرایە، بەڵام ڕێککەوتنەکە لەلایەن حکومەتەوە پێش ئەو ماوەیە لەباربرا و بەغدا ئەو بەڵێنانەی نەبردەسەر کە بە کوردی دابوون ئەوانیش ڕێککەوتنەکەیان بە مردوو لەقەڵەمدا، ئەمەش وای لە حکومەتی عیراق کرد کە لە ئاداری 1974دا یەکلایەنە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد ڕابگەیەنێت بەبێ ڕەزامەندی کورد کە پێیانوابوو ڕێککەوتنە نوێیەکە زۆر لە ڕێککەوتنەکەی 1970وە دوورە.

سەدام حسێن ئەم ڕێککەوتنەی کردە هەنگاوێکی تەکتیکی بۆ قۆستنەوەی کات و پاشان ئیمزاکردنی ڕێککەوتنی جەزائیری ساڵی 1975 بۆ کۆتاییهێنان بە شۆڕشی کورد. پلانەکانی سەدام حسێن هەموویان تەکتیکیی کاتیی بوون بۆ بەدەستهێنانی کات و ئینجا خۆئامادەکردن بۆ شەڕ. سەدام حسێن بەوپێیەی سەرۆکی کۆماربوو هەر بڕیارێکی لێبووردنی بۆ لێبووردن لە کۆمەڵێك سیاسەتمەدار یاخود زیندانی دەربکردایە لە پەراوێزی بڕیارەکەیدا دەستەواژەی

«ئەم بڕیارە جەلال تاڵەبانی بەکرێگیراو ناگرێتەوە»ی دادەنا، تاڵەبانی باسی ئەوەش دەکات و دەڵێت: «لەوانەیە سەدام حسێن بە پیاوێکی زۆر مەترسیداری دانابم، ئەگەرچی پەیوەندییەکی مێژوویی هەبوو لەنێوان بنەماڵەی تاڵەبانی و ئەو عەشیرەتی بێگانەی کە سەدام حسێن سەر بەوانبوو».

هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: «ڕەنگە لەبەر ئەم هۆیە بووبێت ئەو واتە (سەدام حسێن) بە پیاوێکی زۆر مەترسیداری دادەنام، چونکە دەزگا ئەمنییەکانی هەوڵی زۆریاندا بۆ تیرۆرکردنم، جارێکیان کەسێك لە دیمەشق دەستگیرکرا زانیم کە پلانی بۆ تیرۆرکردنم داناوە لە بەرامبەر دوو ملیۆن دۆلاردا لەلایەن حکومەتی عیراقەوە، ملیۆنێکیان پێشەکی وەریگرتبوو ملیۆنەکەی دیکەش دوای جێبەجێکردنی تیرۆرکردنەکە وەریدەگرت، تەنانەت نەوشیروان مستەفا بەگاڵتەوە وتی: با دوو ملیۆن دۆلارەکەمان بدەنێ درێژە بە خەباتمان بدەین و ئێمە تۆیان تەسلیم دەکەین، چونکە ئەوکاتە پارەمان نەبوو».

هەروا تاڵەبانی وتیشی: «جارێکی دیکەش کوردێك دەستگیرکرابوو کە ئێستا لەلای حکومەتی عیراقە یاخود لەگەڵ ئەمریکاییەکاندایە، بڕێك پارەی وەرگرتبوو بۆ تیرۆرکردنم و چالاکییەکی ساختەی ئەنجامدابوو ئۆتۆمبیلێکی تەقاندبووەوە کە لە ئۆتۆمبێلەکەی من دەچوو، بەکردەوەش ڕۆژنامەکانی عیراق ڕایانگەیاند کە جەلال تاڵەبانی کوژراوە و منیش ئاگام لێنەبوو، زەنگی تەلەفۆن لە ماڵەکەم لە دیمەشق لێیدا و منیش قسەمکرد و قسەکەرەکە وتی کە لە ئاژانسی هەواڵی «ڕۆیتەرز»ە و دەیەوێت وردەکاری

کوژرانی تاڵەبانی بزانێت، منیش پێموت: من تاڵەبانیم و هێشتا لە ژیاندا ماوم، ئەویش سەری سوڕما و لە وەڵامدا وتی: بەڵام ڕۆژنامەکانی عیراق ئەمڕۆ کوژرانی تۆیان ڕایانگەیاندووە، منیش وتم: ئەگەر دەتەوێت بفەرموو بۆ ماڵەکەم، من هێشتا زیندووم».

دەگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی جیاکردنەوەی جەلال تاڵەبانی لەو بڕیاری لێبوردنانەی کە سەدام حسێن سەرۆکی پێشووتری عیراق دەریدەکردن و تاڵەبانی لەوبارەیەوە دەڵێت: «سەدام حسێن هەر بڕیارێکی لێبوردنی بۆ داواکراوان یاخود زیندانیان دەربکردایە منی لە بڕیاری لێبوردنەکە دەردەکرد و ئەم ڕستەیەی: (جگە لە جەلال تاڵەبانی بەکرێگیراوی خائین)ی هاوپێچی بەیاننامەکانی دەکرد، جارێکیان لە هەولێر وتاری پێشکەشدەکرد لێبوردنێکی نوێی دەرکرد منیشی تێکرد و وتی: تەنانەت جەلال تاڵەبانیش، ئینجا خۆی لە خەڵکەکەی پرسی وتی: دەزانن بۆچی لێبوردنمان بۆ دەرکردووە؟ کەس وەڵامی نەدایەوە، ئەویش وتی: من پێتاندەڵێم: لە سەردەمی عوسمانیدا والی بەغدا ئابلۆوقەی عەشیرەتەکەمانیدا و شەڕی لەگەڵ کرد بۆیە لە تکریتەوە هەڵاتن بۆ کوردستان و لەوێ لەلایەن تاڵەبانییەکانەوە پێشوازییان لێکرا و بۆ ماوەی دووساڵ بەخشندەبوون لەگەڵیاندا، پاشان تاڵەبانییەکان چوونە لای بابولعالی لە ئەستانبوڵ بۆ ئەوەی لێبوردن بۆ باب و باپیرانمان دەربکات، هەرواشبوو بۆیە منیش وەك ڕێزلێنانێك لەوەی باب و باپیرانی ئەو میوانداریی باب و باپیرانی منیان کردووە ئەوا لێبوردنی بۆ دەردەکەم».

هەروەها تاڵەبانی وتی: «ئەحمەد حەسەن بەکریش ڕازی نەبوو موکەڕەم تاڵەبانی خزممان لەسێدارە بدرێت یاخود تیرۆربکرێت کە لە سەرکردایەتی حزبی شیوعی بوو ئەویش لەبەر داکۆکیکردنی لە بەکر و وتی: پەیوەندی دێرینمان هەیە لەگەڵ تاڵەبانییەکان و ئێمە تاڵەبانییەکان ناکوژین». هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا وتی: «یەکێك لە تاڵەبانییەکان تاوانێکی کوشتنی ئەنجامدابوو کەسوکاری چوون بۆلای سەدام حسێن و پێیانوت:

ئەمە کوڕی شێخ فەیزوڵڵا تاڵەبانییە و ئەویش لێبوردنی بۆ دەرکرد، لەبەرئەوە دەبووایە سەدام حسێن هەر لە سەرەتاوە لێبوردنی بۆ دەربکردمایە، بەڵام منی لە هەموو لێبوردنێك جیادەکردەوە کە دەریدەکردن، بۆ زانیاریش پەیوەندی شەخسیم لەگەڵ سەدام حسێن باشبوو بەرلەوەی شەڕ لە کوردستان دەستپێبکاتەوە، بۆیە کاتێك ژنم هێنا ئاهەنگێکی گەورەی لە (نادي الصيد) و هەروەها لە (جزيرة الاعراس) ڕێکخست کە ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتییەکانی عیراقی بۆ بانگهێشتکردبوو تێیدا ئۆتۆمبێلێکی بەدیاری دایە هێرۆخانی هاوسەرم، ناشزانم بۆچی دواتر ئەو هەموو ڕقەی بەرامبەرم هەبوو».

وەك ئەوەی ڕووداوێکی بەبیرهاتبێتەوە لە قسەکردن دەوەستێت پاشان درێژە دەدات بە قسەکانی و دەڵێت: «سەرەڕای هەمووشتێك ڕقم لە سەدام حسێن نەبووە، دوای ئازادکردنی عیراق لە 2003دا عیزەدین ئەلمەجید ئامۆزای سەدام هات بۆلام و پێیوتم کە خێزانەکەی سەدام حسێن بەشێوەکی نالەبار دەژین و بارودۆخیان زۆرخراپە، منیش پێموت بڕۆ بە خاتوو ساجیدە بڵێ با لەگەڵ کچەکانی و هەموو ئەندامانی خێزانەکەیدا بێت لە هاوینەهەواری دوکان کۆشکیان بۆ تەرخاندەکەم و من میوانداریکردن و پاراستنیان دەگرمە ئەستۆ و کار بەو ئایەتە پیرۆزە دەکەم کە دەڵێت: (ولا تزر وازرة وزر اخرى)، چونکە ئەوان بەرپرسیارنین لەو کارانەی سەدام حسێن کردوونی، لە هیچ کاردانەوەیەکی عیراقییەکانیش نەدەترسام، چونکە دەزانم کە پیاوەتی و ڕەسەنایەتی گەلی عیراق ئەوە دەسەپێنن کە خێزانێکی بێدەسەڵات بپارێزرێت، عیزەدین ڕۆیشت و نەگەڕایەوە، چونکە خێزانەکەی سەدام ڕێگایان بۆ دەرەوەی عیراق دۆزیبووەوە».

حوکم و ڕایەکانی تاڵەبانی مەنتیقین و توندڕەوانە نین، چونکە بۆ نموونە کاتێك باسی سەدام حسێن دەکات چی هەبێت لەسەری بەویژدانێکی ئاسوودەوە دەیلێت، ئەو قۆناغانە دێنێتەوە یاد کە تێیدا سەرۆکی پێشووتری عیراقی بینیووە و دەڵێت: «سەدام حسێنم لە قۆناغی جیاجیای تەمەنیدا بینیووە، چونکە ئەو پێش ئەوەی بێتە سەر حوکم وادیاربوو گەنجێکی زیرەك بوو لە بارودۆخی عیراق تێدەگەیشت، باسی ئەو تاوانانەی دەکرد کە لە ساڵی 1963دا ڕوویانداوە و ئیدانەی دەکردن و ڕەخنەی لە بەرپرسیارانی دەگرت، بگرە باسی حوکمێکی هاوپەیمانیی نیشتمانیی و پەرلەمانیی و پێدانی مافەکانی کوردی دەکرد بە مافی ئۆتۆنۆمیشەوە، کاتێکیش دەستیان بەسەر حوکمدا گرت هەر لەسەر ئەو بیرۆکانەی مایەوە و مەیلی چەپڕەوانەشی پیشاندا کە داکۆکی لە شیوعییەکان کرد و ئازادیکردن و گێڕانیەوە سەر کارەکانیان و داوای ئاشتبوونەوەشی دەکرد لەنێوان هەردوو حزبی شیوعی و بەعسدا، هەروەها پێیوابوو کە کێشەی کورد بەچەك چارەسەر ناکرێت، بەڵکو بەوە دەبێت کە مافەکانیان پێبدرێت، بۆیە ڕایەکانی پێشکەوتنخوازانە بوون، لەبەرئەوە زۆرکەس ئومێدیان پێبوو بەوپێیەی ئەندامێکی چەپڕەوی پێشکەوتنخوازبوو لەناو حزبی بەعسدا، لەبەرئەوەش کە سەربازیی نەبوو ئەوا دەکرا عەسکەرتاریەت لە حوکم دووربخاتەوە و ڕێگە لە دیکتاتۆریەت بگرێت، لەسەر ئاستی دەرەکیش پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێت باشبوو، پشتیوانی حزبە چەپڕەو و سۆسیالیستییەکانی لە جیهاندا کردووە، لەبەرئەوە وەك گەنجێك لە ئەستێرەیەکی سیاسی هەڵکشاو، پێشکەتنخواز و شارستانی، دەچوو، باسی مافی کوردی دەکرد، لە نووسینگەکەشیدا کۆنە شیوعییەك و کوردێك و

شیعەیەکی دامەزراندبوو، ئاواش بەردەوامبوو تا ساڵی 1974 کە دەستیکرد بە گۆڕان بەرەو ڕاست و توندڕەویی و جەنگ لە دژی گەلی کورد».

تاڵەبانی قسەکانی بەم شێوەیە کۆتایی پێهێنا و وتی: «پێموایە ئەگەر بەعسییەکان پارێزگارییان لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ شیوعییەکان بکردایە لەبەرەی نیشتمانیدا و تێوەنەگلانایە لە جەنگ دژی گەلی کورد و بەڵێنەکانی ڕێککەوتنی ئاداریان ببردایەتەسەر، ئەوا ڕووکاری حوکم لەڕووی مێژووییەوە دەگۆڕا».

# بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوک

| ز | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ئەنفال و شۆڕەبی | شیعر و پیرەوەریی | مەلا شاخی | | 1988 |
| 2 | سروودی منالان | سروودی نەتەوایەتی | کۆمەڵێك شاعیر | | 2003 |
| 3 | دیوانی ئالیاسین | شیعری وەرگێڕدراو | محمد حسین ئالیاسین | ئاوات حسن | 2005 |
| 4 | ژیلەمۆی گەرمیان | پیرەوەریی | سەعید شاکەلی | | 2005 |
| 5 | کۆنفرانسی ماددەی (58) | وتار و دیکۆمێنت | | | 2005 |
| 6 | ڕاگەیاندن بەرجەستەکردنی ستەمی ئایدیۆلۆژی | لێکۆڵینەوە | شێرکۆ جەبار | | 2006 |
| 7 | خورماتوو لە پاکتاوی ڕەگەزیدا | لێکۆڵینەوە | حەسەن بارام | | 2006 |
| 8 | فەرهەنگی(ماچۆ)ی کاکەیی | فەرهەنگسازی | هاشم کاکەیی | | 2006 |
| 9 | لەنێوان ئێستا و رابوردوودا | لێکۆڵینەوە | موعتەسەم ساڵەیی | | 2006 |
| 10 | مێژووی ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراو | مێژوویی | سمکۆ بەهرۆز | | 2006 |
| 11 | عەلی بەستێ | کورتە ڕۆمان | حەسەن جاف | | 2006 |
| 12 | ژیاننامە و بەرهەمەکانی پرۆفیسۆر د.زەنون پیریادی | لێکۆڵینەوە | د. زەنون محەمەد | | 2006 |
| 13 | نەخۆشییەکانی ئاژەڵ کە تووشی ئادەمیزاد دەبن | لێکۆڵینەوە | د. عبدالکریم حاجی محمد | | 2006 |
| 14 | کەرکوک لەنێوان پیلان | کۆمەڵە گوتار | هێمن مەولود | | 2006 |
| 15 | کۆمەڵە وتار | وتار | تەها سلیمان | | 2006 |
| 16 | شکستی بلیمەتی | کۆمەڵە وتار | عەبدوڵڵا مەحمود | | 2006 |
| 17 | کەرکوك لەنێوان حەزی خەڵکەکەی و خەونی ئایدیۆلۆژیادا | لێکۆڵینەوە | عەلی مەحمود | | 2006 |
| 18 | دەروونناسی گشتی | دەرونناسی | د. عبدالستار تاهیر | | 2006 |
| 19 | گەنج و تازەگەری | وتار | فەرمان هیدایت | هاوکاری کۆمەڵە | 2006 |
| 20 | ئەنفال دۆزەخی بێگوناهەکان | شیعر | فەرمان هیدایت | هاوکاری کۆمەڵە | 2006 |
| 21 | بەشێك لە ئەنفالی گەرمیان | مێژوو | حەسەن بارام | | 2006 |

مام جەلال وەك خۆی باسیدەکات هەموو بیرەوەرییەکانی لە (14) دەفتەری تێبینی گەورەدا نووسیوەتەوە و هێشتا بڵاوینەکردوونەتەوە، بەو پێیەشبێت ئەوەی لەم بەشانەدا خرانەڕوو، بەشێکی زۆر کەمی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی سەرکردەیەکی بە ئەزموون و سەردەمدیدەیە و لایەنی کەمی وردەکارییەکانی ئەو تەمەنە جەنجاڵ و پڕاوپڕە پیشاندەدات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بیرەوەریانە دەتوانن هیچ نەبێت کەلێنێکی بچووکی ڕووداوە ئاشکرانەکراوەکانی پشت پەردە بخەنەڕوو، هەندێك زانیاری ورد و بایەخدار ئاشکرابکەن کە پێشتر نەزانراون، کەمێك لە کەلێن و بۆشایی ڕاستیی ڕووداوەکان پڕبکەنەوە، وەرگر والێبکەن بەچاوێکی تیژتر ڕووداو و بەسەرهاتەکانی میللەتەکەی بخوێنێتەوە و هەڵوێستی تەواوی کەسایەتییە کاریگەرەکان لەئاست گۆڕانکارییە گرنگەکانی ڕابردوودا تێبگات.

**وەرگێڕ**

لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوک

چاپخانەی

ئاراس

هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil